# الرد على المبتدعة

نوسینی :

أبي علي الحسن بن أحمد بن عبد الله

المعروف بـ ( ابن البناء الحنبلي )

له ساڵی ٤٧١ هـ وەفاتی کردووە

وەرگێڕانی :

مجد الحنبلي

ربيع الأخير / ١٤٤٤ هـ

كتاب

# الرَّدُّ عَلَىٰ المُبْتَدِعَة لِإبنُ البَناءِ الحَنبَلي

(٣٩٥ – ٤٧١ هـ)

وەرگێڕانی :

مجد الحنبلي

لینکی کەناڵ :

https://t.me/mejd_henbeli

# پێشەکی

ئەمە کتێبی (الرد على المبتدعة)ی ابي علي الحسن بن احمد ە، کە ناسراوە بە ابن البناء الحنبلي، وە ئەمە کتێبێکە کە نوسیویەتی بۆ ڕوون کردنەوەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە، وە بۆ ڕەدد دانەوەی ئەو کەسانەشی کە سەرپێچی لێ دەکەن کە ئەهلی بیدەع و هەوا و ئارەزوون .

جا ئەم کتێبە بە شێوازی مسند نوسراوە و پێکدێ لە ٢٤ باب، وە لەسەر ڕێگەی کتێبەکانی سەلەفی ئوممەت نوسراوە کە یاد هێنانەوە و بەڵگە لە خۆ دەگرێت لە قورئان و سوننەت و ئاثاری سەلەف، وە خاڵیە لە بەناو علمی کەلام کە زەمکراوە بە کۆدەنگی هەموو زانایانی ئەهلی سوننە .

بەڵام کتێبەکە سەرەڕای هەموو ئەم شتانە خاڵی نیە لە نەپێکان و هەڵە، نوسەر لە هەندێك بابەت نەیپێکاوە و پێچەوانەی زانایانی سەلەفی صالح قسەی کردووە، جا لە هەر بەشێکی کتێبەکە نوسەر نەیپێکابێت ئەوا ئێمە ڕوون کردنەوەمان داوە دەربارەی و هەڵەکەیمان خستووەتە ڕوو بۆ ئەوەی موسوڵمانانی ئەهلی سوننە ئاگاداری هەڵەکانی بن .

## ناساندنی نووسەر :

ناوی نوسەر : حەسەنی کوڕی أحمدی کوڕی عبداللَّه ی بەغدادی حەنبەلی المقریء .

کونیەکەی : باوکی عەلی .

نازناو : إبن البناء الحنبلي .

لە دایکبوونی : ٣٩٦ هـ

وەفاتی : ٤٧١ هـ

## مامۆستاکانی :

١ - هلال الحفار .

٢ - ابي القاسم الغوري .

٣ - ابي محمد السكري .

٤ - ابي الحسين و ابي القاسم کە هەردووکیان کوڕی بشران ن .

٥ - ابي الفتح کوڕی ابي الفوراس .

٦ - ابي الحسن الحمامي .

## قوتابییەکانی :

١ - ابو غالب أحمد و يحيى كە هەردووكیان كوڕی حمیدی ن .

٢ - ابو الحسین الفراء .

٣ - ابو بكری كوڕی عبدالباقي .

٤ - ابن الحصين .

٥ - ابن ابي يعلى .

٦ - ابو القاسم ابن السمرقندي .

وە جگە لەوانەش .

## وتەی زانایان دەربارەی :

١ - **ابن عقيل** دەڵێت :

ئەو شێخ و پێشەوایە لە زۆرێك لە زانستەكانی، وەك : فەرموودە، قیرائەتەكان، عەرەبی، وە طبقەیەك لە ئەدەب، و مۆنراوە، و ڕەسائیل، باشیەتی عبادەت .

٢ - **ابن رجب** دەڵێت :

پێشەوا، مقریء، فەرموودەناس، فەقیه، ئامۆژگاریكار، وە خاوەنی چەندەها نوسراو بوو .

# باب : ١

## فەزڵی ئەهلی فەرموودە (أهل الحديث)



١ - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (وە بەردەوام كۆمەڵێك لە مسوڵمانان دەجەنگن لەسەر حەق، زاڵ و سەركەوتوون بەسەر ئەوانەی دوژمنایەتییان دەكەن هەتاكو ڕۆژی قیامەت) .

٢ - امام أحمد لە گێڕانەوەی الفضل بن زیاد وتی : ئەگەر ماوەڵانی فەرموودە نەبن ئەوا نازانم ئەوان كێن .

٣ - وە احمد لە گێڕانەوەی نعیم بن طریف وە دەربارەی فەرموودەی رسول الله ﷺ كە دەفەرمووێت : (بەردەوام الله كەسانێك ثابت و پڕ عیلم دەكات بە لەم دینەدا بە ثابت كردنێك) .

وتی : ئەوان ماوەڵانی فەرموودەن كە (أبدال) ن .

---

: ئەم فەرموودەیە لە لەفزی دیکەدا ماتووە کە دەفەرمووێت : (بۆ گوێڕایەڵی خۆی بەکاریان دەهێنێت)، جا ابن تیمیة لە [جامع المسائل -المجموعة الثانية (٣/٦٧)] وتی : مانای صحیح بۆ أبدال بریتییە لەوەی کە ئەوان جێگرەوەی پێغەمبەرانن .

٤ - مؤمل بن اسماعیل وتی :

گوێم لە فضیل بن عیاض بوو دەیوت : کاتێك سەیری پیاوێك دەکەم لە ئەهلی سوننە، وەکو ئەوە وایە سەیری پیاوێك لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ بکەم .

# باب : ٢

## وەسفی سوننەت و چۆنییەتیەکەی



٥ - لە عمران بن حصين ـەوە رضي الله عنه : کە باسی فەرموودەیان دەکرد، جا پیاوێك وتی : واز لەمە بهێنن - واتە لە فەرموودە - ، بەڵکو کتێبی الله ـمان بۆ بهێنن .

عمران فەرمووی : تۆ گەمژەیت؛ ئایا نوێژ بە تەفسیرکراوی دەدۆزیتەوە لە کتێبی الله ـدا؟

ڕۆژوو بە تەفسیرکراوی دەدۆزیتەوە لە کتێبی الله ـدا؟

قورئان حوکمەکەی دەدات، وە سوننەتیش تەفسیری دەکات .

٦ - ابو الحسن علي بن احمد البوسنجي وتی : سوننەتەکان شەشن :

سوننەتێك تایبەتە بە الله تعالى، وە سوننەتێك بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە سوننەتێك بە ابو بکر و عمر رضي الله عنهما، وە سوننەتێك بە خەلیفەکانی، و سوننەتێك بە هاوەڵانی رضي الله عنهم، وە سوننەتێك بە تەواوی ئیمانداران .

جا ئەو سوننەتەی کە لە لایەن الله عزوجل ەوەیە، ئەوەیە کە دەفەرمووێت : ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٦٢﴾ ﴾ [الاحزاب] ، کە فەرزەکانە .

ئەوەش کە بۆ رسول الله یە ﷺ ، ئەوەیە کە دەفەرمووێت : (هەر کەس پشت لە سوننەتی من بکات ئەوا لە من نییە) .

جا ئەوەش کە بۆ ابو بکر و عمر ە رضي الله عنهما، ئەو فەرموودەیەیە کە دەفەرمووێت : (ئیقتیدا بەوانەی دوای منەوە بکەن) .

وە ئەوەش کە بۆ خەلیفەکانە، ئەو فەرموودەیەیە کە دەفەرمووێت : (دەست بگرن بە سوننەتی من و سوننەتی خەلیفە هیدایەتدراو و ڕێنمونیکارەکانی دوای منەوە).

وە ئەوەش کە بۆ تەواوی هاوەڵانە رضي الله عنهم، ئەو فەرموودەیەیە کە دەفەرمووێت : (هاوەڵانم وەکو ئەستێرەکانن، جا بە هەر کامێکیان ئیقتیداتان کرد - واتە کردتانە پێشەنگی خۆتان لە کاروکردەوەکانتان - ، ئەوا ڕێنمونی دەکرێن) - ئەم فەرموودەیە تضعیف کراوە لە لایەن : ابو بکر البزار و ابن کثیر، و جگە لەوانیش - .

جا ئەوەش کە بۆ تەواوی ئیمانداارانە ئەو فەرموودەیەیە کە دەفەرمووێت : (هەر کەس لە ئیسلامدا ڕێبازێکی چاك بڵاو بکاتەوە، ئەوا پاداشتی ئەو ڕێبازە و ئەوانەشی بۆ هەیە کە کاری پێ دەکەن) .

# باب : ٣

## هۆشیاری دان له بیدعه‌كان



٧ - كثير بن عبدالله له‌باوكیه‌وه‌، له‌ باپیریه‌وه‌ رضي الله عنه‌، وتی : گوێم له‌ رسول الله ﷺ بوو كه‌ ده‌یفه‌رموو : (هه‌ر كه‌سێك سوننه‌تێك زیندوو بكاته‌وه‌ كه‌ مرێنراوه‌ له‌ دوای من، ئه‌وا پاداشتی بۆ هه‌یه‌ به‌ نمونه‌ی پاداشتی ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ كاری پێ ده‌كات له‌ خه‌ڵكی كه‌ هیچیش له‌ پاداشتی خه‌ڵكی كه‌م نابێته‌وه‌ .

وه‌ هه‌ر كه‌س بیدعه‌یه‌ك دابهێنێ كه‌ الله‌ و پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی پێی ڕازی نین، ئه‌وا گوناهی له‌سه‌ره‌ به‌ وێنه‌ی گوناهی ئه‌و خه‌ڵكه‌ی كه‌ كاری پێ ده‌كات، هیچیش له‌ گوناهه‌كانی خه‌ڵكه‌كه‌ش كه‌م نابێته‌وه‌) .

---

: ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ له‌ الترمذي (٢٦٧٧)، وه‌ ابن ماجة (٢٠٩) و (٢١٠) هاتووه‌ . وه‌ ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ صحيح نییه‌، وه‌ كثير بن عبدالله تۆمه‌تبار كراوه‌، وه‌ك ئیمامی شافعي ئه‌ڵێت : كثير بن عبدالله ڕوكنێكه‌ له‌ ڕوكنه‌كانی درۆ.

٨ - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : شوێن بکەون و داهێنان مەکەن - بیدعە ئەنجام مەدەن - ، بەڕاستی ئەوە بەسە بۆتان، وە هەموو داهێنراوێکیش گومڕاییە.

٩ - وە إبن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : کەمی لە سوننەتدا، باشترە لە هەوڵدان و ئیجتیهاد لە بیدعەدا .

: واتە کردەوەیەکی کەم کە بەشێوەی سوننەتی ئەنجامی دەدەیت و بە عەقیدەیەکی اهلی سوننەوە دەیکەیت زۆر چاکترە لە کردەوەیەکی زۆر کە بەشێوەی بیدعە و بە عەقیدەیەکی گومڕایی ئەنجامی بدەیت.

١٠ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەر کەسێك فەرموودەیەك بگەیەنێت بە ئوممەتەکەم بۆ ئەوەی بە سوننەتێك هەڵسن، یان بۆ ئەوەی بیدعەیەکی پێ لەناو ببرێت، ئەوا بەهەشت بۆ ئەوە) .

: لە سەنەدەکەی : اسماعیل بن یحیی هەیە؛ کە بە ئیجماع مەتروکە.

# باب : ٤

## ئاگاداربوون و خۆپاراستن له ئه‌هلی بیدعه



١١ - له عمر بن خطاب رضي الله عنه كه پێغه‌مبه‌ر ﷺ به عائشة رضي الله عنها ی فه‌رموو : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا ﴿١٥٩﴾ ﴾ [الأنعام] .

(ئه‌وانه هاوه‌ڵانی بیده‌عن، و هاوه‌ڵانی هه‌وا و ئاره‌زوون، وه هاوه‌ڵانی گومڕایین له‌م ئوممه‌ته، بۆیه ئاگاداریان به ئه‌ی عائیشه، به ڕاستی بۆ هه‌موو خاوه‌ن تاوانێك ته‌وبه هه‌یه جگه له هاوه‌ڵانی بیده‌ع كه ته‌وبه‌یان بۆ نییه، من له‌وان به‌رییم و ئه‌وانیش له من به‌ریین) .

---

: ابن كثير له (البداية و النهاية - ٢٥/٩) وتی : ئه‌مه فه‌رمووده‌یه‌كی ضعیف و نامۆیه .

١٢ - رسول الله ﷺ فه‌رمووی : (هاوه‌ڵانی بیده‌ع سه‌گی ناو ئاگرن) .

---

: ئەم فەرموودەیەش صحیح نیە بەڵام ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (خەواریجەکان سەگی ناو ئاگرن), والله اعلم ثابتە .

**١٣** - محمد بن عبدالملك الدقيقي وتی : هشام بن عروة بۆی باسکردین، وە لە غەیری ئەوە ڕیوایەتی کردووە، وتی : هەر کەسێك ڕێزی خاوەن بیدعەیەك بگرێت - بە گەورەیان سەیر بکات و لەگەڵیان دابنیشێت - ، ئەوا یارمەتی داوە بۆ ڕووخاندنی ئیسلام.

**١٤** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەر کەس ڕووی لە خاوەن بیدعەیەك وەرگێڕا لەبەر ئەوەی ڕقی لێیەتی لە پێناوی الله، ئەوا الله دڵی پڕ دەکات لە دەوڵەمەندی و ئیمان.

وە هەر کەس خاوەن بیدعەیەکی دەرکرد، ئەوا الله پارێزراوی دەکات لە ترسە گەورەکەی ڕۆژی زیندوو بوونەوە .

وە هەر کەسێك سەلامی لە خاوەن بیدعە کرد و بە ڕوویەکی خۆشەوە پێی گەیشت و بە ڕوویەکی کراوەوە تەماشای کرد، ئەوا بەڕاستی سووکایەتی بەوە کردووە کە دابەزیوەتە سەر محمد علیە الصلاة و السلام) .

---

: ابو النصر السجزي وتی : ئەم فەرموودەیە مەتن و سەنەدەکەی نامۆیە .

# باب : ٥

## سیفەتی بیدعەکان



١٥ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەڕاستی ئەهلی دوو کتێبەکە - واتە گاور و جولەکە - ، جیابوونەوە بۆ حەفتا و دوو ڕێباز لە دینەکانیاندا، وە ئەم ئوممەتەش جیادەبێتەوە بۆ حەفتا و سێ ڕێباز، واتە هەوا و ئارەزوو، وە هەموویان لە ئاگردان جگە لە یەك دانە، ئەویش جەماعەتە) .

١٦ - المسیب بن واضح وتی : گوێم لەیوسف بن اسباط بوو، دەیوت : بنچینەکانی بیدعە چوارن : ڕافیزەکان، و خەواریجەکان، و قەدەرییەکان، و مورجیئەکان .

پاشان هەر کۆمەڵەیەکیان هەژدە لقی لێ دەبێتەوە، جا ئەمە حەفتا و دوو کۆمەڵەکەیە، وە حەفتا و سێهەمینیان : بریتییە لە جەماعەت، کە رسول الله ﷺ لەبارەیانەوە فەرموویەتی : (ئەوە کۆمەڵەی ڕزگاربووە) .

وە من ئەمەم لە کتێبێکی جیا شەرح کردووە .

# باب : ٦

## نەهی كردن لە مشتومڕ و ناكۆكی



١٧ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هیچ قەومێك لە پاش ئەوەی لەسەر هیدایەت بوونە، گومڕا نەبوونەتەوە، ئیللا مشت و مڕ و ناكۆكییان تووش بووە) .

پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًاۢ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ خَصِمُونَ ۝٥٨ ﴾ [الزخرف] .

١٨ - إیاس بن معاویة وتی : مشتومڕ و ناكۆكی لە دیندا كردەوەكان بەتاڵ دەكاتەوە.

١٩ - وە عمر بن عبدالعزیز وتی : هەر كەس دینەكەی بكاتە هۆیەك بۆ مشتومڕ و ناكۆكی؛ ئەوا زۆر دەگوازێتەوە.

: والله اعلم، واتە زوو زوو دەگۆڕێت لە دینێكەوە بۆ دینێكی تر یان لە عەقیدەیەكەوە بۆ عەقیدەیەكی تر.

**٢٠** - وه معروف الكرخي وتی : ئەگەر اللە خێری بۆ بەندەیەك بوویت؛ ئەوا دەرگای کردەوەی لێ دەکاتەوە و دەرگای مشتومڕی لێ دادەخات، وە ئەگەر شەڕی بۆی بوێت، ئەوا پێچەوانەکەی لەگەڵ دەکات .

# باب : ٧

## هۆشیاریدان لە : الكلام، و هەوا و ئارەزووەکان، و مشتومڕ کردن



**٢١** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (من کەفیلی ئەو کەسەم کە واز لە مشتومڕ بهێنێ ئەگەر لەسەر حەقیش بێت بە ماڵێك لە خوارەوەی بەهەشت، وە بە ماڵێك لە ناوەڕاستی بەهەشت، وە بە ماڵێك لە سەرەوەی بەهەشت) .

**٢٢** - معمر هەواڵی پێداین و وتی : ابن طاووس دانیشتبوو جا پیاوێك لە موعتەزیلە هات بۆ لای و دەستی کرد بە قسە کردن .

وتی : ابن طاووس پەنجەی خستە ناو گوێیەکانی و بە کوڕەکەی وت : کوڕی خۆم؛ پەنجەت بخە گوێیەکانت و بە توندیش بیخە ناوی، وە هیچ شتێکیش لە قسەکانی مەبیستە .

معمر وتی : واتە دڵ لاوازە .

**٢٣** - وه به اسنادێك له عبدالرزاق ـوه، وتی : ابراهيم بن محمد بن ابي يحيی پێی وتم : دەبينم لای ئێوه موعتەزيله زۆرن .

وتم : بەڵێ، وه ئەوان پێيان وايه كه تۆش لەوانيت !

وتی : بۆ نايەيته ئەو دوكانەوه تا قسەت لەگەڵ بكەم ؟

وتم : نەخێر .

وتی : بۆچی ؟

وتم : لەبەرئەوەی دڵ لاوازه و دينيش لای ئەو كەسه نييه كه دەيباتەوه - واته مەرج نييه ئەوەی مناقەشه بباتەوه لەسەر حەق بێت - .

# باب : ٨

# ئەوەی كە زانایان وتویانە دەربارەی كەلام و ئەهلەكەی، وە هۆشداياريان داوە لە كلام و ئەهلەكەی، وە فەرمانیان كردووە بە دووركەوتنەوە لەو كەسەش كە تێكەڵیان دەبێت



**٢٤** - أبو قلابة دەیوت : لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوو دامەنیشن، وە مشتومڕ و مناقەشەیان لەگەڵدا مەكەن، چونكە من ئەمین نیم لەوەی كە بتانخەنە ناو گومڕاییەكەیانەوە، یاخود ئەوەتان لێ بشێوێنن كە دەیزانن .

**٢٥** - وە لە ابي العالية وە وتی : دوو ئایەت لە كتێبی الله هەن كە چەندە توندن لەسەر ئەوانەی مشتومڕ دەكەن دەربارەی قورئان : ﴿ مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴿٤﴾ ﴾ [غافر]

﴿ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِي ٱلۡكِتَٰبِ لَفِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ﴿١٧٦﴾ ﴾ [البقرة]

وه لەبارەیانەوە ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦ ۝٦٨ ﴾ [الأنعام]

٢٦ - اسماعيل بن بكر السكري وتی : گوێم لە ابا داود السجستاني بوو بە أبي عبدالله احمد بن حنبل ی دەوت : پیاوێك دەبینم لە ئەهلی سوننە لەگەڵ پیاوێكدایە لە ئەهلی بیدەع، ئایا واز لە قسە كردن بهێنم لەگەڵی ؟

وتی : نەخێر، یان تێی بگەیەنە ئەو پیاوەی كە لەگەڵ ئەودا بینیوتە خاوەنی بیدعەیە، جا ئەگەر وازی لە قسە كردن لەگەڵی هێنا ئەوا تۆش قسەی لەگەڵ بكە، ئەگەر نا وەكو ئەو حسابی بۆ بكە.

ابن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : پیاو لەگەڵ هاوڕێكەیەتی .

٢٧ - احمد وتی : هەر كەس خۆی خەریك بكات بە كلامەوە سەركەوتوو نابێت .

٢٨ - وه هەر ئەو - واتە امام احمد - وتی : هەر كەس كلامی خۆش بوێت؛ دەرناچێت لە دڵی، وه كاروباریشی ناگاتەوە بە خێر و باشە .

٢٩ - وه وتی : لەگەڵ هاوەڵی كلام دامەنیشە ئەگەر چی دیفاعیشی لە سوننەت كرد .

٣٠ - وه أبو یوسف وتی : هەبوونی زانست بە كەلام نەزانییە، وه نەزانینی كلام زانستە .

٣١ - عبدالله وتی : گوێم له باوکم بوو دەیوت : ئەگەر الشافعي رحمه الله هەواڵێکی لەلا جێگیر بوایە ئەوا شوێنی دەکەوت - واتە ئەگەر ئەثەری پێ بگەشتایە و ثابت بوایە لای، وەکو ئەوەی دەکرد - .

وە باشترین سیفەت لەودا ئەوەبوو حەزی لە کەلام نەبوو، ئەوەی لەلای گرنگ بوو فیقهـ بوو .

---

: بەناو عیلمی الکلام ئەوەیە کە جەهمی و موعەزیلە و کوللابی و کەڕامی و ئەشعەری و ماتوریدی و باقی فیرقە کەلامیە کوفریەکانی دیکە عەقیدە خۆیانیان لەسەر بنیاتناوە.

٣٢ - لە ربیع بن سلیمان ـوە، الشافعي وتی : ئەگەر بەندە بگاتەوە بە الله و هەموو تاوانێکی ئەنجام دابێت جگە لە هاوبەش بڕیاردان بۆی، ئەوا باشترە لەوەی پێی بگاتەوە بە شتێك لە هەوا و ئارەزوو .

٣٣ - وە لە محمد بن عبدالحکم ـەوە، وتی : گوێم لە الشافعي بوو دەیوت : ئەگەر خەڵکی دەیانزانی چ هەوا و ئارەزوویەك لە کەلامدا هەیە، ئەوا لێی هەڵدەهاتن هەر وەکو چۆن لە شێر هەڵدێن .

٣٤ - وە لە الحسین بن علی ـوە، وتی : گوێم لە الشافعي دەیوت : حوکمی من بۆ هاوەڵانی کەلام ئەوەیە کە : لێیان بدرێت بە لقی دارخورما، وە سواری حوشتر بکرێن و بەناو هۆز و خێڵەکاندا بسوڕێنرێنەوە، وە بانگ بکرێن و پێیان بوترێت : ئەمە پاداشتی

ئەو كەسانەیە كە وازیان لە قورئان و سوننەت هێناوە، و دەستیان گرتووە بە كەلامەوە.

٣٥ - وە یزید بن هارون، كە باسی جەهمییەكانی كرد وتی : سوێند بە الله ئەوان زندیقن، نەفرەتی الله یان لێبێت.

٣٦ - وە فضیل بن عیاض وتی : لەگەڵ خاوەن بیدعە دامەنیشە؛ چونكە دەترسم نەفرەت دابەزێتە سەرت .

٣٧ - وە هەر ئەو وتی : ئەمین مەبە لە خاوەنی بیدعە و دینەكەتی مەدەرە دەست - واتە لای ئەو فێری دین مەبە یان پرسیاری دینی لەو مەكە، والله اعلم - ، وە ڕاوێژی پێ مەكە لە كاروبارتدا، وە لای دامەنیشە؛ چونكە هەر كەس لای خاوەن بیدعە دانیشت؛ ئەوا الله كوێری بۆ جێدەهێڵێت - واتە كوێری دڵ - .

٣٨ - وە هەر ئەو وتی : هەر كەس كچەكەی لە بیدعەچییەك مارە بكات؛ ئەوا سیلەی ڕەحمی لەگەڵ دەپچڕێت .

٣٩ - وە هەر ئەو وتی : هەر كەسێك شوێنی تەرمی بیدعەچییەك كەوت؛ ئەوا بەردەوام لە ژێر توڕەیی الله دایە هەتاوەكو دەگەڕێتەوە - واتە تاكو تەوبە دەكات، والله اعلم -

.

٤٠ - وە مالك بن أنس وتی : مشتومڕ لە زانستدا دڵ ڕەق دەكات، وە ڕق و كینەش جێدەهێڵێت .

**٤١** - إبراهيم وتى : لەگەڵ ئەهلى هەوا و ئارەزوو دامەنيشن؛ چونكە دانيشتن لەگەڵيان نورى ئيمان لە دڵدا لادەبات، وە جوانيش لە ڕووخسار دەسێنێتەوە، وە ڕق لە دڵى ئيمانداران جێدەهێڵێت .

**٤٢** - وە حسن البصري وتى : خاوەن بيدعە الله نە نوێژ، نە ڕۆژوو، نە حەج و نە عەمرە، نە جيهاد، نە فەڕز و نە سوننەتى نافيلەى لێوەرناگرێت، چونكە ئەو ڕەددى سوننەتەكەى داوەتەوە; جا الله تعالى ش ڕەددى بيدعەكەى دەداتەوە .

# باب : ٩

## دووركەوتنەوە و نزيك بوونەوە لێیان



**٤٣** - عبدالصمد بن يزيد الصائغ المردويه وتی : گوێم فضيل بن عياض دەربارەی فەرمايشتی پێغەمبەر ﷺ : (ڕۆحەكان چەند جۆر و كۆمەڵەيەكی جياوازن، جا هەرچييەكی پێ باش بوو لەگەڵی كۆك دەبێت، وە هەرچيشی پێ خراپ بوو لەگەڵی جياواز دەبێت) .

وتی : بۆيە ناكرێت خاوەن سوننە مەيلی بۆ خاوەن بيدعە هەبێت مەگەر لە دووڕووييەوە بێت .

---

: واتە مەيل هەبوون بۆ خاوەن بيدعە كاری دووڕووەكانە، والله اعلم .

**٤٤** - وه إبن مسعود رضي الله عنه وتی : ئەگەر ئیمانداریك بچێته ناو مزگەوتێکەوه کە سەد کەسی تێدابێت و هیچیان ئیماندار نەبن تەنیا یەکێکیان نەبێت، ئەوا دەچێت لای ئەو دادەنیشێت .

وه ئەگەر دووڕوویەك بچێته ناو مزگەوتێکەوه سەد کەسی تێدابێت و هیچیان دووڕوو نەبن تەنیا یەکێکیان نەبێت، ئەوا دەچێته لای ئەو دادەنیشێت .

: واته ئەگەر دوو کەس هەمان بیر و بۆچوونیان نەبێت، ئەوا کۆك نابن، وه نابن به هاوڕێی یەکتر، بۆیه دوو کەس کە زۆر هاوڕێیەتی یەکتریان کرد ئەوا بێگومان لەناو سەدان کەس تەنیا دەچنه لای یەکتر، جا بوونی هاوڕێی بیدعەچیش به هەمان شێوەیه، والله اعلم .

**٤٥** - وه الأعمش وتی : ئەوان پرسیاریان دەربارەی پیاوێك نەدەکرد دوای ئەوەی سێ شتیان بۆ دەردەکەوت : ئەو شوێنەی پێیدا دەڕوات، ئەو شوێنەی بۆی دەچێت، ئەو کەسەشی کە ئەم خۆشی دەوێت لە ناو خەڵکیدا .

**٤٦** - وه الأوزاعي دەیوت : هەر کەس بیدعەکەیمان لێ بشارێتەوه، ئەوا ناتوانێت خۆشەویستەکەیمان لێ بشارێتەوه .

**٤٧** - وه ابن شوذب وتی : لە نیعمەتی الله بۆ سەر گەنج و ئەعجمی ئەوەیه کە ئەگەر دەستیان کرد بەوەی ببنە خاوەن عبادەت، لەگەڵ خاوەن سوننەیەك ڕێك بکەون بۆ ئەوەی هانیان بدات لەسەر سوننەت .

٤٨ - وه عمرو بن قيس الملائي وتى : ئەگەر گەنجت بینی یەکەم شت کە لەسەری پێدەگات لەگەڵ ئەهلی سوننە و جەماعە بوو ئەوا ئومێدت بۆی هەبێت، وە ئەگەر بینیت لەگەڵ ئەهلی بیدەع بوو ئەوا لێی بێ ئومێد بە؛ چونکە گەنج لەسەر ئەوەیە کە سەرەتا لەسەری پێگەیشتووە .

٤٩ - وه حماد بن زيد وتى : يونس پێی وتم : ئەی حماد، من گەنج ببينم لە هەموو حاڵەتێکی خراپە و تاوانکاری، لە باش بوون و خێری ئەو بێ ئومێد نابم، هەتاوەکو نەیبینم ھاوڕێیەتی خاوەن بیدعە دەکات؛ جا ئەو کات دەزانم کە تیاچووە .

٥٠ - وه به الأوزاعي وترا : پیاوێك دەڵێت من لای ئەهلی سوننە دادەنیشم و لای ئەهلی بیدەعیش دادەنیشم .

وتی : ئەم پیاوە دەیەوێت حەق و باطل بەیەکەوە کۆ بکاتەوە .

٥١ - له خويل ەوە - زاواى شعبة - وتى : لای یونس بن عبید بووم و پیاوێك هات و وتی : ئەی باوکی عبدالله نەهیمان لێ دەکەیت لە دانیشتن لەگەڵ عمرو بن عبید کەچی کوڕەکەشت چووەتە ماڵەکەی !

يونس وتی : کوڕەکەی من ؟!

وتی : بەڵێ .

جا شێخ توڕە بوو - واتە يونس بن عبيد - .

خويل وتی : جا من جێم نەهێشت تاوەکو کوڕەکەی هات.

پێی وت : کوڕم، بۆچوونی منت دەربارەی عمرو زانی و پاشانیش چوویتە لای؟!

کوڕەکەی وتی : فڵانم لەگەڵ بوو . جا دەستی کرد بە بیانوو هێنانەوە .

ئەوجا یونس وتی : نەهیت لێ دەکەم لە زینا و دزی کردن و مەی خواردنەوە، وە ئەگەر بەو تاوانانەوە بگەیتەوە بە اللە پێم خۆشترە لەوەی پێی بگەیتەوە بە ڕا و بۆچوونی عمرو و هاوەڵەکانی عمرو .

# باب : ١٠

## ئەوەی کە زندیقەکان و مولحیدەکان دایان ناوە سەبارەت بە ئەهلی سوننە و هاوەڵانی فەرموودە



**٥٢** - علي بن المديني وتی : زندیقەکان فەرموودەیەکیان دانا کە هیچ بنچینەیەکی نییە، ئەویش ئەوەیە : (وتەی من لەگەڵ کتێبی الله بەراورد بکەن، جا ئەگەر لەگەڵی موافقەی هەبوو و ڕێك کەوت ئەوا من وتوومە، وە ئەگەر لەگەڵی ڕێك نەکەوت ئەوا من نەموتووە) .

**٥٣** - وە أبو محمد عبدالله بن مسلم بن قتيبة وتی : زندیقەکان هەندێك فەرموودەیان داناوە لەسەریان کە هیچ ئەسڵێکی نییە :

**٥٤** - لەوانە : فەرموودەی : (عەرەقەی ئەسپ) .

---

: مەبەستی لەو فەرموودە هەڵبەستراوەیە کە دەڵێ : (الله ئەسپی دروست کرد، عەرەقەی کرد، دواتر نەفسی خۆی لە عەرەقەی ئەسپەکە دروست کرد) . پەنا بە الله لە قسەیەکی لەم شێوەیە .

**٥٥** - (وه مووی سینگ، و نوری دوو قۆڵەکان) .

---

: ئەو ئەثەرەی کە دەڵێت : الله مەلائیکەی لە نوری سینگ و دوو قۆڵەکانی دروست کردووە، ئەوە ثابتە لای ئەهلی عیلم و هیچ کێشەی نییە، لێرەدا مەبەستی ئەوەیە کە زەندقیەکان وشەی موویان بۆ زیاد کردووە .

**٥٦** - وە (عیادەی مەلائیکەکان) - مەبەست لەمەیە کە دەڵێ : (الله تعالی چاوەکانی دەیەشا، جا مەلائیکەکان بۆیان چارەسەر کرد) پەنا بە الله لە قسەیەکی ئاوا - .

وە هاوشێوەی ئەمانە کە هیچ موسڵمانێك نییە باوەڕی پێی هەبێت .

پاشان ئەوان هەندێك شتیان دەربارەیان وت کە مولحیدەکان پێی پێکەنین :

**٥٧** - لەوانە : کە پیاوێك لەوان پرسیاری لێکرا دەربارەی مشکێك کە کەوتووەتە ناو بیرێکەوە؟

ئەویش وتی : (ئەوەی دەکەوێتە ناو بیر خوێن و تۆڵەی بۆ نییە) .

---

: هۆکاری پێکەنینەکەیان لەو وەڵامەدا ئەوە بوو کە : ئەو پرسیارە دەچێتە بابی نەجاسات [پیسی] لە فیقهدا، وە ئەوەی وەڵامی داوەتەوە استدلالی بە دەلیلێك کردووە کە لە بابی خوێنەکان [الدَّیات] دایە، نەک لە بابی پاکی و پیسی

٥٨ - وە پرسیار لە یەکێکی تریان کرا دەربارەی وتەی الله تعالی

: ﴿ رِيحٍ فِيهَا صِرٌّ ﴿١١٧﴾ ﴾ [آل عمران ] .

ئەویش وتی : ئەوە ئەو زیکە زیکی سیسرکە بە شەوان .

- لێرەوە قسەی ابن البناء ە - : وە نموونەی ئەمانە لە درۆ و بوهتان کە الله هیچ بەڵگەیەکی لەبارەیانەوە دانەبەزاندووە .

وە ئەوەشیان بۆیان زیاد کردووە - واتە بۆ ئەهلی سوننە - : تەشبیهـ و تەجسیم، وە جۆرەهای تری لەم شێوەیە لە وتەکانیان کە الله پاك ڕایگرتوون لێی، وە بەری کردوون لێی .

بەڵکو ئەوان درۆزنانێکی قێزەونن، وە موشریکانێکی پیسن ﴿ يُرِيدُونَ أَن يُطْفِئُوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾ [التوبة] .

٥٩ - ابن قتيبة وتی : تێڕامانم لە وتەکانی ئەهلی کەلام کرد و بۆم دەرکەوت کە ئەوان قسانێك دەربارەی الله دەڵێن کە نایزانن، وە عەیب لە خەڵکی دەگرن بەوەی پێی هاتوون، لەبەر ئەوەی هاوەڵانی فەرموودە کۆدەنگییان هەیە :

لەسەر ئەوەی کە الله ویستی لە هەرچی بوو ڕوویدا، وە ویستی لەهەرچی نەبوو ڕووی نەدا .

وە لەسەر ئەوەی کە ئەو دروستکەری باشە و خراپەیە .

وە لەسەر ئەوەی کە قورئان کەلام و وتەی الله یە و مخلوق نییە .

وە لەسەر ئەوەی کە ئەو دەبینرێ لە ڕۆژی قیامەتدا .

وە لەسەر پێشخستنی دوو شێخەکە واتە ابو بکر و عمر رضي الله عنهما .

وە لەسەر بڕواهێنان بە سزای گۆڕ و نیعمەتەکانیشی .

وە بە پردی صراط و تەرازوو و حەوزی کەوسەر و شەفاعەت و دروستبوونی بەهەشت و ئاگر، وە هاوشێوەی ئەمانە .

وە ئەوان چەند ئیمامێکی پێشەنگ و بە وەرع و موجتەهیدیان هەیە، وە ئیقتیدا بە هاوەڵانەوە دەکەن رضي الله عنهم، وە بە پێشینی چاکی دوای ئەوانیش ئیقتیدا پێ دەکەن، کە ئەوان بریتین لە : مالك بن انس، سفیان الثوري، ابن عیینة و الشافعي و أحمد بن حنبل .

وە ئەوان کەسانێکی کۆدەنگی زۆرن سوپاس بۆ الله، وە ژمارەی زۆرترن، وە وتەکانیان ناوداره لە ناو وڵاتان، و لە ناو بەندەکاندا، وە ئەگەر کەسێك لە موتەکەلیمین - واتە لە ئەهلی کلام - وتەیەکی لە دەم بێتە دەرەوە ئەوا دەیکوژن، خۆ ئەگەر کەسێك دەرکەوێت یارمەتی بدات ئەویشی لەگەڵ حساب دەکەن .

جا ئەوان - واتە ئەهلی کلام - وتانێکی قێزەون، وە جامیلانێکی ناشرینیان هەیە، وە بیروباوەڕێکی کوفری و گومڕاییان هەیە .

٦٠ - وە پاشان وتی : ئایە النظام - واتە إبراهیم بن سیار، کە گەورەی موعتەزیلەکان بوو، ئیجماعی ڕەتکردەوە - ، بەیانی نەدەکردووە لەسەر مونکەڕ و خراپەکاری؟ وە ئێوارەی

نەدەكردەوە لەسەر سەرخۆشكەر؟ وە توانجی لە ابو بكر و عمر و غەیری ئەوان نەدەدا لە هاوەڵان بە وتانێك كە دایهێنابوو؟ وە كاروبارانێك كە هەڵیبەستبوو؟

وە ابن قتيبة زۆر شتی دیكەی باسكرد، و وەڵامیشی دایەوە.

وە دەبینین ابو الهذيل درۆزنێكی بوختانچییە.

وە دەبینین هشام بن حكم رافیزەیەكی زیادەڕەوە.

وە دەبینین ثمامة دینی لاوازە، وە كەموكورتی لە ئیسلام دەگرت بە قێزەونترین وتە و شێوە.

پاشان دەبینین الجاحظی بوختانچی لە كتێبەكانیدا مەبەستی گاڵتە و گەپ دەنوێنێ؛ وە بەوە دەیەوێت: مەیلی بۆ داهێنراوەكان و مەیخۆرەكان هەبێت، وە گاڵتە بە فەرموودە دەكات بە گاڵتەپێكردنێك كە ناشاردرێتەوە لەلای ئەهلی عیلم، وەكو باسی كردووە:

(جگەری نەهەنگ).

: مەبەستی ئەوەیە كە گاڵتەی بەم فەرموودەیە كردووە: (یەكەم خواردن كە ئەهلی بەهەشت دەیخۆن زیادەی جگەری نەهەنگە) رواه البخاري ٣٣٢٩.

وە (شاخی شەیتان).

: مەبەست لەمەشیان گاڵتەکردنیەتی بە فەرموودەی رسول الله ﷺ کە فەرموویەتی : (نوێژەکانتان مەخەنە نزیك کاتی خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابوون، چونکە خۆر لە نێوان شاخەکانی شەیتان هەڵدێت) رواه البخاري ٣٢٧٣ .ومسلم ٨٢٩ .

وە باسی بەردە ڕەشەکەی کرد کە پێشتر سپی بووە، جا موشریکەکان ڕەشیان کردووە .

وتی : وە دەبوو موسڵمانەکان سپیان بکردایەتەوە کاتێك بوون بە موسڵمان .

وە باسی ئەو لاپەڕەیەش دەکات کە بەشێك لە قورئانی دابەزێنراوی تێدا بووە و لەژێر جێگاکەی عائشة رضي الله عنها بووە و مەڕێك خواردوویەتی - واتە بە گاڵتە پێکردنەوە باسی کردووە - .

وە شتانێك لە فەرموودەکانی ئەهلی کتاب لەوەی کە کەڵەشێر و قەلەڕەش شەرابیان بە یەکتر داوە، وە ئەوەی کە هد هد دایکی لە سەریدا دەشارێتەوە، وە تەسبیحاتکردنی بۆق، وە ئەو ڕەنگی پەڕەی کە دەوری ملی کۆتری داوە کە جیاوازە لە ڕەنگی پەڕەکانی تری .

وە شتانێکیش کە بە ناشرینی و عەیبدارکردنەوە باسیان دەکات، وە ئەو لەگەڵ ئەم هەموو شتانەشدا درۆزنترینی ئومەتە، وە زۆرترین فەرموودەی هەڵبەستووە، وە لە هەموویان زیاتر سەرخەری باتڵە .

# بەشێك

٦١ - وە هەر ابن قتيبة وتی :

. وە پێم گەیشتووە كە لای هەندێك لە ماوەڵانی كەلام مەی حەڕام نییە؛ چونكە بەلای ئەوەوە الله وەكو ئەدەب نەهی لێكردووە، كە فەرموویەتی : ﴿ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ ٱلْبَسْطِ ﴿٢٩﴾ ﴾ [الإسراء]

یان فەرموویەتی : ﴿ وَٱهْجُرُوهُنَّ فِي ٱلْمَضَاجِعِ وَٱضْرِبُوهُنَّ ﴿٣٤﴾ ﴾ [النساء] .

. وە لەناو ئەواندا كەسانێك هەن كە نیكاح كردن لەگەڵ نۆ ئافرەتی ئازاد بەلایەوە ڕێپێدراوە، لەبەر فەرمایشتی الله : ﴿ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ﴿٣﴾ ﴾ [النساء] .

وە دەڵێت : ئەوەتا ئەمە نۆیە - واتە كە الله دەفەرمووێت دوو و سێ و چوار، ئەم هەمووی كۆكردووەتەوە كە دەكاتە نۆ دانە - .

وە دەشڵێت : بەڵگە بۆ ئەم قسەیە ئەوەیە کە رسول اللە ﷺ وەفاتی کرد و نۆ ژنی لەدوای خۆی جێهێشت، وە اللە ش ڕێگەی بەو - واتە پێغەمبەر ﷺ - نەداوە لە قورئاندا بەو شتە نەبێت کە ڕێگەی بە ئێمەش داوە.

وە لەوان کەسانێك هەیە کە چەوری و پێستی بەراز بە حەڵاڵ دەزانن، لەبەر ئەوەی اللە گۆشتەکەی حەڕام کردووە .

وە لەوان کەسانێك هەیە کە دەڵێت : اللە هیچ شتێك نازانێت هەتاوەکو ڕوو نەدات، وە هیچ شتێك دروست ناکات هەتاوەکو نەجوڵێت .

وە شتی دیکە لەم ڕووەوە کە پێچەوانەی ئیجماعە، وە لەعنەتی اللە لەو کەسەی ئەو بیروباوەڕەی هەیە .

## بەشێك

٦٢ - ابن قتيبة وتى : وە لە نەزانى ئەهلى كەلام ئەوەيە : كە قورئان بە مەزهەبەكانى خۆيان تەفسير دەكەن، وە بە وتەكانيان تەئويل و لێكدانەوەى بۆ دەكەن.

٦٣ - جا كۆمەڵێك لەوان دەربارەى فەرمايشتى الله تعالى : ﴿ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ ﴾ [البقرة]

وتيان : مەبەست لەمە زانستەكەيەتى - واتە مەبەست لە كورسى الله زانستە، پەنا بە الله، بەڵكو كورسى جێى پێيەكانى الله يە هەروەك لە ئەثەرەكەى ابن عباس هاتووە - .

كە ئەمە مەڵەيەكى قێزەونە، عەرەب نازانێت عەرش چييە مەگەر بە جێگايەك كە لەسەرى دابنيشێت .

الله تعالى دەفەرمووێت : ﴿ وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ﴾ [يوسف] .

وتى : جێگايەك كە لەسەرى دابنيشيت .

٦٤ - وە كۆمەڵێك لەوان دەربارەى فەرمايشتى الله تعالى : ﴿ وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا ﴾ [يوسف] .

وتیان : ئافرەتەکە ویستی فاحیشەی هەبوو، یوسفیش ویستی هەڵهاتن و لێدان لە ئافرەتەکەی هەبوو، وە الله دەفەرمووێت : ﴿ لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦ ﴿٢٤﴾ ﴾.

ئایا تۆ پێت وایە ویستی هەڵهاتن و لێدانی هەبووبێت، جا کاتێك بەڵگەکەی بینیبێ هەستابێ لەلای ئافرەتەکە ؟!

: والله اعلم، واتە ئەگەر ویستی لێدان و هەڵهاتنی هەبووبێت ئەوا پێویستی بە بەڵگە نەدەکرد پیشانی بدرێت .

٦٥ - وە کۆمەڵێکی دیکە دەربارەی فەرمایشتی الله تعالی : ﴿ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ﴾ [طه] .

وتیان : ئادەم خواردنی ئەو دارەی لەسەر قورس بوو - واتە دوای خواردنی هەستی بە ناموڕتاحی کرد، والله اعلم - .

وە بۆ ئەو قسەیەی عەرەب دەچن کە دەڵێن : بێچووی حوشترەکە تێکچوو، تێکدەچێت، بە تێکچوونێك، ئەگەر زۆری شیر خواردەوە هەتاوەکو تێر دەبێت، وە ئەو گومڕابوونە - واتە وشەی فَغَوَى - واتە تێکدەچێت بە تێکچوونێك .

٦٦ - وە کۆمەڵێکی دیکە دەربارەی فەرمایشتی الله تعالی : ﴿ وَلَقَدۡ ذَرَأۡنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ ﴿١٧٩﴾ ﴾ [الأعراف] .

وتیان : واتە خستمانە ناوی .

بۆ ئەو قسەیەی خەڵکی دەچن کە دەڵێن : ذرته الرِّيح - واتە با بڵاوی پێکردەوە و بەم لاو بەم لادا بردوویەتی - .

وە ئەمە هەڵەیە، لەبەر ئەوەی ذرته الرِّيح هەمزەی نییە، وە ذرأك هەمزەی هەیە .

وە دروست نییە بڵێن أذرته الدابة عن ظهرها - واتە وڵاخەکە لە پشتی خۆی فرێی دایە خوارەوە - ، کە : بە مانای ئەگەر خستیە خوارەوە دێت، لەبەر ئەوەی وشەی دروستمان کرد، فعلێکە بە هەمزەوەیە، بەڵام وشەی فرێیدا، فعلێکە بە بێ هەمزەیە .

: الكرجي قصاب لە (نكت القرآن) - ١/٤٥٠، دەڵێت : فەرمایشتی الله : ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ﴾، حوججەیە لەسەریان، واتە بۆ سەر قەدەریە معتزیلیەکان، چونکە گومانی تێدا نییە کەسێ شارەزابێت بە زمان دەزانێت کە ﴿ذَرَأْنَا﴾ واتە درووستمان کرد (خلقنا)، هەروەکو چۆن لەشوێنێکی تر هاتووە : ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي ذَرَأَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ﴾ . [المؤمنون - ٧٩] .

وە دەفەرمووێت : ﴿جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ أَزۡوَٰجٗا يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِۚ﴾ [الشورى - ١١]

واتە : لە ڕەحمدا درووستمان کردوون، والله اعلم .

**٦٧** - وە ئەوان لەبارەی فەرمایشتی الله : ﴿وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾﴾ [النساء] .

وتیان : واتە فەقیر بۆ ڕەحمەتی الله، کردیان بە الخَّلة بە فەتحە خستنە سەر پیتی خاء.

جا ئەمە مەڵەیە، ئەگەر وابێت لێرەدا چ فەزیلەتێك بۆ ابراهیم هەیە، لە کاتێکدا خەڵکی هەموویان فەقیرن بۆ الله؟

ئایا إبراهیم علیه السلام خۆشەویست نییە بۆ الله هەروەکو چۆن وتراوە : موسا ئەو کەسەیە کە الله قسەی لەگەڵ کردووە - کلیم الله - ، وە عیسا ڕوحی الله یە .

جا هەر وەکو چۆن پێیان ناخۆشە الله خۆشەویستی کەسێك بێت لە دروستکراوەکانیدا، دەبوایە بەهەمان شێوە ئەمانەشیان پێ ناخۆش بوایە .

---

: الخَّلة بە واتای پێویستی و فەقیری دێت، بەڵام خلیل لەم ئایەتە مەبەست پێی الخُّلة یە کە مانای خۆشەویستی و هاوڕێیەتی دەدات .

هەروەها ڕوح سیفەتی الله نییە بەڵکو مەخلوقێکە و وەکو تەشریف و ڕێز الله داویەتیە پاڵ ناوی خۆی، بەهەمان شێوەی حوشترەکەی پێغەمبەر صالح کە الله لەبارەیەوە دەفەرمووێت ﴿**ناقة الله**﴾، والله اعلم .

٦٨ - وه ئەوان دەربارەی فەرمایشتی الله تعالی : ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ ۝٦٤ ﴾ [المائدة] .

وتیان : یَد - كە خۆی بە مانای دەست دێت - لەم ئایەتە واتە نیعمەت - تەحریفكردنی سیفەتی دەست ی الله تعالی عەقیدەی جەهمی و ئەشعەری و موعتەزیلە كافرە مولحیدەكانە - .

وه ئەمە هەڵەیە، لەبەر ئەوەی فەرمووی : ﴿ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ ﴾ وەكو بەرپەرچ دانەوەیەك بۆ ئەوەی كە یهود وتیان .

پاشان فەرمووی : ﴿ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ ﴾ لەبەر ئەوەی نیعمەتەكان ڕەزیل و چروك نابن .

وه لەبەرئەوەی زانراوە كە ناوترێت یدین، دەوترێت : یداه، وە نیعمەتەكانی الله لەوە زۆرترن كە پەی پێ ببرێت، هەر وەك فەرموویەتی : ﴿ وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ۝٣٤ ﴾ [إبراهيم] .

وه فەرموویەتی : ﴿ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ ۝٧٥ ﴾ [ص]




٦٩ - ابن قتيبة وتی : وە هەروەها ماوەڵانی فەرموودە؛ کە ئەوان دەستیان گرتووە بە حەق بەو شێوەیەی خۆی، وە لە سەرچاوەی خۆیەوە شوێنی حەق کەوتوون، وە لە الله تعالى نزیك بوونەتەوە بە شوێنکەوتنیان بۆ سوننەتەکانی پێغەمبەرەکەی علیه الصلاة و السلام، وە گەڕان بۆ ئاثارەکانی لە وشکانی و دەریاوە، وە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە، وە بە دوای صحیحەکەی و نەخۆشەکەیدا گەڕاون، لەگەڵ ناسخەکەی و مەنسوخەکەی، وە ئەو فەقیهانەیان ناسی کە بۆ ڕەئی دەچوون و سەرپێچی ئاثارەکانیان دەکرد، جا خەڵکیان لێ ئاگادار کردنەوە، تاوەکو ڕاستی دەرکەوت لە دوای ئەوەی کە شاردرابووەوە، وە بەرز بووەوە لە دوای ئەوەی کە نزم کرابوو .

وە تانە لێدەرەکان بە هێنانی فەرموودەی لاواز و بە گەڕان بۆ فەرموودەی غریب عەیبیان لێ دەگرتن وە ئەوان بۆیە وایان دەکرد تا جیاکاری لە نێوانیان بکرێت، وە ئەو کارەشیان کرد .

ئەوجا لە بارەی فەرموودەی مرفوعەوە وتیان :

٧٠ - (خواردنەوەی ئاو لە پێش نان خواردن چەوری نامێڵێت) .

عاصم الكوزي هەڵی بەستووە، ئەو کەسەی کە کارەکەی دروستکردنی کوپ بوو .

٧١ - وە فەرموودەی : یونس، لە حسن ەوە : (کە پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە دە کونیە) .

أبو عصمة ی دادوەری مَرو هەڵی بەستووە، وە لەم ڕووەوە زۆرێکی تریشی هەڵبەستووە.

وە نمونەی ئەم فەرموودانە کەس هەڵینابەستێ مەگەر زەندیقێکی مولحید کە گاڵتەی پێ دەکات، وە ناشرینی دەکات لەسەر هاوەڵانی فەرموودە و ئەهلی سوننە، هەر وەکو ئەوانەی کە هەڵبەستراون :

٧٢ - (نەفسی خۆی لە عەرەقەی ئەسپ دروست کردووە) .

وە هاوشێوەی ئەوە و زۆرێکی تر کە الله تعالى زۆر گەورەترە لەوەی کە ئەوە سیفەتی بێت .

ابن قتیبة وتی : وە فەرموودەی صحیح هاتوون، وەکو :

٧٣ - (دڵی ئیماندار لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی الرحمن دایە عَزّوَجَل) .

٧٤ - وە (الله ئادەمی لەسەر وێنەی خۆی دروست کردووە) .

٧٥ - وە (هەردوو دەستی ڕاستن) .

**٧٦** - وه (زەوی لەسەر پەنجەیەك هەڵدەگرێت، وه بەو شێوەیە لەسەر پەنجەیەك) .

**٧٧** - وه (جنێو بە با مەدەن، چونكە ئەوە لە هەناسەی الرحمن ەوە دێت) .

وه غەیری ئەمانە لە فەرموودە صحیحەكان كە پێشەوایانی متمانە پێكراو نەقڵیان كردووە، ئیمان هێنان پێیان واجبە، وه تەفسیر ناكرێن، وه ناشوبهێنرێن، وه چۆنیەتەكەشی نازانرێت .

---

: واتە تەفسیر ناكرێت بەو تەفسیرەی كە ئەهلی بیدەع كردوویانە، وە بە مەخلوقاتیش ناشوبهێنرێن، و چۆنیەتەكەی نازانرێت، والله اعلم .

## بەشێك

٧٨ - إبن قتيبة وتى : وە هەروەها توانج دانيان لەسەريان بە ئاواز و گۆڕينيان بۆ غەيرى ماناكەى خۆى، كە ئەمە تەنها لە دەگمەنەكانيان هەيە، وە من كەسێك ناناسم لە ئەهلى عيلم و ئەدەب ئيللا كەوتووەتە هەڵەوە لە زانستەكەيدا، وەكو : الأصمعي، و أبي زيد، و أبي عبيدة، و سيبويه، و الأخفش، و الكسائي، و الفراء، و أبي عمرو الشيباني.

جا خەڵكى هەڵەى مانا و ئيعرابيان گرتووە لە شاعيرەكانى جاهيليەت و ئيسلام، كە ئەوان ئەهلى زمانەوانيش بوون، وە ئيحتيجاجيشيان پێوە دەكرا .

جا كوا ئەو كەسەى عەيبى لە الزهري گرتووە كە الزهري زاناترين كەس بووە بە هەموو هونەرێك، وە حماد بن سلمة، و ابن عون، و أيوب، و يونس بن عبيد، و سليمان التيمي، و سفيان الثوري، وە يحيى بن سعيد، و إبن جريج، و الأوزاعي، و شعبة، و عبدالله بن مبارك، وە نمونەى ئەوان و دواى خۆيان لە پێشەواكان .

## بەشێك

**٧٩** - وە ابن قییبة وتی : وە ئەوان نازناویان لە ئەهلی سوننە ناوە بە : الحشـویة، و النابتة، و المجبرة، وە لەوانەیە وتبێتیان : الجبریة .

وە ناویان لێ ناون : الغثاء، و الغثر .

---

: الحشـویة : ئەوانەن کە پشتیان پێ نابەسترێت لە خەڵکی و زەلیلن، وە واتە ئەوانەی کە گرنگی بە ئەثەری پێش خۆیان دەدەن .

النابتة : واتە ئەوان وەکو گژوگیان بچووکن، مەبەستیان ئەوەیە تازە پێگەیشتوون و پشتییان پێ نابەسترێت .

المجبرة و الجبریة : ئەمە ئەهلی قەدەر بە ئەهلی سوننەی دەڵێن، واتە هەر کەس لای ئەوان دان بە قەدەردا بنێ ئەوا مەجبور کراوە .

الغثاء : واتە ئەو پوش و پەڵاشـەی لەسەر ئاو کۆدەبێتەوە .

الغثر : واتە عەوامی خەڵك، والله اعلم .

وە ئەم نازناوانە هیچیان نەهاتوون لە رسول الله وە ﷺ، وە لە هاوەڵانیشیەوە نەهاتوون، هەر وەکو چۆن هاتووە دەربارەیان لە رسول الله وە ﷺ :

٨٠ - القدرية : (ئەوانە مەجوسی ئەم ئوممەتەن) .

: ئەهلی علم جیاوازیان هەیە لەسەر حوکمی ئەم فەرموودەیە بەڵام زۆربەیان لەسەر ئەوەن کە ضعیفە بە مرفوعی .

٨١ - وە لەبارەی الرافضة :

(ئیسلام ڕەفز دەکەنەوە و لە پشتیانەوە تەرکی دەکەن) .

: ئەم فەرموودەیە : العقيلي تضعیفی کردووە .

٨٢ - وە دەربارەی المرجئة : (دوو کۆمەڵە لە ئوممەتەکەم شەفاعەتی من نایانگرێتەوە؛ مورڕجیئەکان و قەدەرییەکان) .

: إبن القيم لە [تهذيب السنن ١٢/٢٩٨] دەڵێ :

ئەوەی کە بە صحیحی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتبێ دەربارەی زەم کردنی ئەهلی بیدەع، خەواریجەکانن، چونکە دەربارەیان (واتە خەواریجەکان) فەرمووده هاتووە بە ثابتی لە چەند ڕوویەکەوە کە هەموویان صحیحن، لەبەر ئەوەی وتەکانیان لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دەرکەوتبوو .

بەڵام ئیرجاء، و رفض، و قەدەر و تجهم و حلول و غەیری ئەوانە لە بیدعەکان؛ لە دوای کۆتایی هاتنی سەردەمی هاوەڵان دەرکەوتن .

جا بیدعەی قەدەر : لە کۆتایی سەردەمی هاوەڵان دەرکەوت، هەریەك لەو هاوەڵانەی کە ئەو کاتە زیندوو بوون نکۆڵیان لێکرد وەکو : عبدالله بن عمر، إبن عباس، وە هاوشێوەکانیان .

بۆیە زۆرترین وتە دەربارەی زەمکردنیان هاتبێ ئەوا : موقوف بووە بۆ سەر هاوەڵان کە وتەیان هەیە دەربارەیان .

پاشان بیدعەی ئیرجاء دەرکەوت لە دوای کۆتایی هاتنی سەردەمی هاوەڵان، کە گەورە و کیباری تابعین ئەوانەی کەوا پێیان گەیشتوون قسەیان دەربارەی کردووە هەروەکو چۆن دەربارەیان باسمان کرد، پاشان بیدعەی تجهم - جەهمیەکان - دەرکەوت لەدوای کۆتایی هاتنی سەردەمی تابعین .

٨٣ - وە دەربارەی الخوارج : (دەردەچن لە دین) .

٨٤ - وە ئەوان - واتە الخوارج - : (سەگی ناو ئاگرن) .

٨٥ - وە بۆیە ناونراون مەجوس، چونکە مەجوسیەکان دەڵێن دوو خوا هەیە : خوای ڕووناکی کە بۆ باشەیە، وە خوای تاریکی کە بۆ خراپەیە .

جا قەدەرییەکان دەڵێن : ئێمە ئەوە دەکەین کە الله ویستی لێ نییە .

: جا ئەگەر الله ویستی لە ڕوودانی شتێك نەبێت چۆن ڕوودەدات؟! پەنا بە الله لەوەی قەدەرییەكان دەیڵێن .

**٨٦** - وە پێم گەیشت كە پیاوێك لە هاوەڵانی كلام بە پیاوێكی ئەهلی ذِمة ی وت : ئایا موسڵمان نابیت؟

ئەویش وتی : هەتاوەكو الله بیەوێت .

وتی : بە ڕاستی الله ویستوویەتی، بەڵام ئەوە شەیتانە لێت ناگەڕێت .

جا پیاوە الذمي یەكە وتی : كەواتە من لەگەڵ بەهێزترینیاندام .

---

: الذمي واتە : ئەوانەی ئەهلی كتاب كە لە ژێر دەسەڵاتی موسڵماناندا دەژین و جزیە دەدەن .



## بەشێك

وە لە غلوچی و گومڕاكانیان :

**٨٧** - جهم بن صفوان .

**٨٨** - ابن شوذب وتی : چل ڕۆژ وازی لە نوێژ هێنا لەبەر هەبوونی گومان - واتە گومان لە ئیسلام - .

**٨٩** - وە كاتێك لە شام بوو پێی وترا : دەتەوێ بۆ كوێ بچیت؟

وتی : بە دوای پەروەردگارێك دەگەڕێم بیپەرستم .

**٩٠** - وە معبد الجهني .

**٩١** - الحسن وتی : لەگەڵی دامەنیشن چونكە ئەو گومڕای گومڕاكەرە .

**٩٢** - وە عمرو بن عبيد .

**٩٣** - أبو النضر وتی : گوێم لێی بوو توانجی لە هاوەڵان دەدا، و دەیوت : ابن عمر حشوي بووە - لە ئەثەری ٧٩ وشەی حشوي ڕوونكراوەتەوە - .

**٩٤** - وه معاذ بن معاذ وتى : گوێم لێ بوو دەیوت : ئەگەر ﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ ۝١ ﴾ [المسد] له لوح المحفوظ دا هەبێت، ئەوا الله هیچ حوججەیەکی نییە بەسەریەوە - واتە بەسەر ابو لهب - .

**٩٥** - وه قیس العباسي وتى : پرسیارم لێکرد لەبارەی مەسەلەیەکەوه، وەڵامی نەدامەوه .

جا وتم : هەر دەبێت بۆ من بێت .

وتى : ئاخۆ ناردنی محمد هەر دەبوو ببێت؟ کەواتە مەسەلەی تۆ چییە؟

وه ئەو دونیا نەویستی نیشان دەدا بۆ چەواشەکاری و شاردنەوەی ڕووی ڕاستەقینەی، کەچی له بیروباوەڕدا خراپتر بوو له ئیبلیس .

**٩٦** - وه لەسەر وتەکەی ئەو : بشر المريسي .

**٩٧** - يحيى بن معين وتى : له خەونمدا له ڕێگای خۆراسان بوون له شەوی جومعەدا ئیبلیسم دی أخزاه الله وتى : هیچ شارێك بوونی نییە ئیللا دۆستێکی منی تێدایە.

وتم : جا کێ دۆستی تۆیە له عێراق ؟

وتى : بشر المريسي لعنه الله بانگەوازی خەڵکی بۆ ئەوە کرد کە من نەمتوانی بیکەم، وتى : قورئان مخلوقە .

٩٨ - وه لەناویاندا : غيلان القدري، و ثمامة بن أشرس، و الجبائي، و ابن ابي دؤاد، و برغوث، و ربالويه، و أبو شعيب الحجاج، و سهل الجزار، و أبو لقمان الكافر، و حفص الفرد .

٩٩ - و الشافعي رحمه الله ناوى لێنا : المنفرد - واته ناوى له حفص الفرد نا، ئیمام الشافعي مونازەرەی لەگەڵدا کرد و تەکفیری کرد - .

وه پێی وت : نیوەت ئیمانداره و نیوەت کافره .

١٠٠ - وه أبو علي بن البناء - نوسەری کتێبەکە - وتی : وه کتێبێکم لەسەر ئەوان و نمونەکانیان ئامادە کردووە تێیدا باسی ئەو ڕسوایی و پۆخڵەواتیانەیان دەکەم کە لێیانەوە گێڕدراوەتەوە .

١٠١ - علي بن الحسن القصري، وتی : گوێم له أبو الهذيل بوو دەیوت :

ڕۆژێکیان المأمون به دەرگاوانەکەی وت : سەیرکە بزانە کێ لای دەرگاکەیە له ماوەڵانی کلام.

ئەویش چووە دەرەوە و گەڕایەوە لای و وتی : لای دەرگاکە ابو الهذيل العلاف لێیە کە ئەو موعتەزیلەیە .

وه عبدالله بن اباض : كه اباضي ه .

وه هشام بن الكلبي : كه ڕافیزەیە .

المأمون وتی : کەس نەماوە له زاناکانی ناو جەهەننەم ئیللا هەموویان لێرە ئامادەن!

**١٠٢** - وه ابو عبدالله محمد بن العباس المصري وتى : گوێم له هارون الرشيد بوو دهیوت : به دوای چوار شت گهڕام له چوار شتدا دۆزیمهوه .

به دوای كوفر گهڕام، له ناو جههمییهكاندا دۆزیمهوه .

وه به دوای كهلام و ئاژاوه گهڕام، لای موعتهزیله دۆزیمهوه .

وه به دوای درۆدا گهڕام، لای ڕافیزه دۆزیمهوه .

وه بهدوای حهقدا گهڕام، لای هاوهڵانی فهرمووده دۆزیمهوه .




١٠٣ - وە أبو علي - نوسەری کتێبەکەیە - وتی : وە ئەم دەروازانە چەند دەربڕینێك دەگرێتەوە لە وتەکانی امام أحمد بن حنبل رحمە اللّٰه لە نامیلکەکەدا، وە منیش ئەوەی کە ماوەتەوە لە وتەکانی لە هەموو دەروازەکان - باب ەکان - ، بە کورتی و پوختی دەگێڕمەوە إن شاء اللّٰه تعالى .

# باب : ١١

# بڕواهێنان بە قەدەر بە خێر و شەڕییەوە



**١٠٤** - عبدالله رضي الله عنه وتی : رسول الله ﷺ کە ڕاستگۆی باوەڕپێکراوە، بۆی باسکردین : (هەر یەکێك لە ئێوە دروستکردنەکەی کۆدەبێتەوە واتە دڵۆپە ئاوێك لە چل ڕۆژدا لە سکی دایکیدا، پاشان بە هەمان شێوە - واتە چل ڕۆژی دیکە - دەبێت بە خوێنێکی مەیوو، پاشان بەهەمان شێوە دەبێت بە پارچە گۆشتێك، ئینجا الله فریشتەیەك دەنێرێت و فووی پێدا دەکات و ڕۆح دەکات بەبەریدا، پاشان فەرمان بە فریشتەکە دەکرێت بە چوار شت : ڕزقەکەی بنوسە، وە کردەوەکەی، و ئەجەلەکەی، وە ئاخۆ بەد بەخت دەبێت یان بەختەوەر، سوێند بەوەی کە هیچ پەرستراوێك نییە شایەنی پەرستن بێت بە حەق جگە لەو یەکێك لە ئێوە بە کردەوەی ئەهلی ئاگر کردەوە دەکات، هەتاوەکو ئەوەی کە لە نێوان ئەو و ئاگر هیچ نامێنێتەوە تەنیا بە ئەندازەی قۆڵێك نەبێت، جا ئەوەی کە لەسەری نوسراوە پێشی دەکەوێت، بە کردەوەی ئەهلی بەهەشت کردەوە دەکات و دەچێتە ناویەوە، وە یەکێك لە ئێوە بە کردەوەی ئەهلی بەهەشت کردەوە دەکات، هەتاوەکو ئەوەی کە نێوان ئەو و بەهەشت هیچ نامێنێتەوە

تەنها بە ئەندازەی قۆڵێك نەبێت، جا ئەوەی كە لەسەری نوسراوە پێشی دەكەوێت و بە كردەوەی ئەهلی ئاگر كردەوە دەكات و دەچێتە ناویەوە) .

إمام أبو الفتح الحافظ وتی : ئەم فەرموودەیە صحیحە، مسلم گێڕاویەتیەوە، لە أبي بكر بن أبي شيبة، و ابن نمير، لە أبي معاوية ـوە .

بە سەنەدێكی عالي كەوتووەتە دەستمان، وەك بڵێیت شێخەكەمان لە مسلم بن الحجاج ـەوە بۆی باس كردبين .



١٠٥ - ابن قتيبة وتى :

١٠٦ - وە موعتەزيلە ڕەخنەيان لەم فەرموودەيە گرت، وتيان :

١٠٧ - ئێوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوتانەتەوە کە فەرموويەتى : (هەموو لەدايك بوويەك لەسەر فيترەت لە دايك دەبێت هەتا ئەو کاتەى دايك و باوکى دەيکەن بە جولەکە ياخود گاور) .

جا ئەمە هەڵوەشێنەرەوەيە لە نێوان هەردوو فەرموودەکەدا - مەبەستيان فەرموودەکەى أثري ١٠٤ هـ - .

١٠٨ - وتى : وە ئەمە هەڵەيە لەوانەوە .

فيترەت لێرەدا واتە : سەرەتا و بونيادنان، وە لە فەرمايشتى الله تعالى هاتووە :
﴿ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ۝١ ﴾ [فاطر] واتە : دروستکەريان و داهێنەريان .

وە فەرموويەتى : ﴿ فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَا ۝٣٠ ﴾ [الروم] .

مەبەستى : ئەو فيترەتەى کە خەڵکى لەسەر دروست کردووە .

وه مەبەست لەم فەرمایشتە : (هەموو لەدایك بوویەك لەسەر فیترەت لە دایك دەبێت) : بریتییە لەو بەڵێنەی کە الله لێیانی وەرگرت کاتێك لە پشتی باوکانیان بوون :

: ﴿ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ ﴿١٧٢﴾ ﴾

تۆ هیچ کەسێك دەست ناکەوێت ئیللا ئەو کەسە دان بەوە دەنێت کە دروستکەرێك و بەڕێوەبەرێکی هەیە، ئەگەر چی ناوێکی غەیری ناوەکەی خۆشی لێ بنێیت - والله اعلم، واتە ناو لە دروستکەرەکەی بنێت - ، الله عزوجل دەفەرمووێت : ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ﴿٨٧﴾ ﴾ [الزخرف]

جا هەموو لە دایك بوویەك لە جیهاندا لەسەر ئەو بەڵێن و دان پێدانانەیە .

---

: ڕوونکردنەوە لەسەر ئەثەری (١٠٥ بۆ ١٠٨) :

ڕووی هەڵوەشێنەرەوەکە لای موعتەزیلە ئەوەیە کە فەرموودەکەی ابو هريرة دەلالەت لەوە دەکا کە هەموو کەس لەسەر فیترەتی ئیسلام لە دایك دەبێت بۆیە بە موسڵمانێتی لە دایك دەبێت، پاشان دەرچوونی لە ئیسلامەوە بۆ کوفر لە باوك و دایکیەوە دەبێت، جا ئەو بەدبەختیەی کە توشی دەبێ ئەوە لەو دوانەوەیە نەك لەو خێر و شەڕەی کە الله تعالى لەسەری تەقدیری کردووە !

وە لە فەرموودەی إبن مسعود دەلالەت لەوە دەکات کە بەدبەختی و بەختیاری تەقدیر کراون و نوسراونەتەوە لەسەر کەسەکە لە لایەن الله تعالى وە لە کاتێکدا کەسەکە لە سکی دایکی دایە .

جا لەبەر ئەمەیە کە ئەوان وتیان ئەم دوو فەرمودەیە دژ بە یەکن .

وە ئەوەی کە ڕاست و دروستە، ئەوەیە کە : دوو فەرموودەکە دژ بە یەك نین و هەردووکیان دەلالەت لەوە دەکەن کە مرۆڤ فیترەتی لەسەر خێرە بە بەهێزی، جا ئەگەر لە ئەهلی بەختیاری بێت لە

زانستی الله دا، وه به گوێرەی عاقیبەت و خاتیمەی کەسەکە، ئەوا الله کەسێکی بۆ دەنێرێ وەکو هاوڕێ تا ڕێی ڕاست و خێری نیشان بدات، بەڵام ئەگەر لە ئەهلی بەدبەختی بێت، ئەوا الله کەسێکی بۆ دەنێرێ هاوڕێیەتی بکا و ڕێی خراپی پیشان بدات و هانی بدا لەسەر خراپە، تا ئەوەی کە بە خاتیمەیەکی خراپ کۆتایی پێ بێت] .

**١٠٩ - ڕسول الله ﷺ دەفەرموویێت : (الله دەفەرموویێت : بەڕاستی من هەموو بەندەکانم بە بێ شرك و لەسەر توحید دروستکردووە، ئینجا شەیتانەکان لە دینەکەیان لایان بردن و دینەکەیانی پێگۆڕین) .**

پاشان جولەکە منداڵەکانیان دەکەن بە جولەکە، وە مەجوس منداڵەکانیان دەکەن بە مەجوس، واتە : ئەوەیان فێر دەکەن، ئەوجا حوکم بەو دانپێدانانەی یەکەم نادرێت و پاداشتیش لەسەری وەرناگیرێت .

ئایا نابینی کە منداڵێك لە منداڵانی موشریکەکان کە باوك و دایکی لەسەر چ دینێك بوون، ئەوا ئەویش حوکمی بۆ دەدرێت بەو دینەی ئەوان، نوێژیشی لەسەر ناکرێت ئەگەر مرد، پاشان ئەگەر لە ژێر سەرپەرشتی ئەواندا دەرچوو بۆ ژێر سەرپەرشتی خاوەنێکی موسڵمانان، ئەوا حوکمی بۆ دەدرێت بە دینی خاوەنەکەی، وە ئەگەر مرد نوێژیشی لەسەر دەکرێت، وە لە پشت ئەمانەوە الله علمی پێی هەبووە .

وە جیاوازی نێوان ئەهلی قەدەر و ئەهلی إثبات - واتە ئەوانەی دان بە قەدەر دەنێن وەکو خۆی - ، لەم فەرموودەیەدا ئەوەیە کە فیترەت لای ئەهلی قەدەر واتە ئیسلام، جا بۆیە دوو فەرموودەکە لای ئەوان یەکتر هەڵدەوەشێننەوە .

بەڵام لای ئەهلی إثبات فیترەت واتە : ئەو بەڵێنەی کە لێیان وەرگیراوە ئەو کاتەی کە دروست بوون، جا هەردوو فەرموودەکە یەکیان گرتەوە و جیاوازیان نەبوو لای ئەوان .

---

ڕوونکردنەوە لەسەر ئەثەری ١٠٩ :

وتە دەربارەی مەبەست لە فیترەت کە لەم فەرموودەیە هاتووە : ئەو پەیمان و بەڵێنە بێت کە الله لە نەوەی ئادەمی وەرگرت، یەکێکن لەو وتە زۆرانەی کە باس کراون لە ماناکردنەوەی ئەم فەرموودەیە کە ئەمە وتەی : حماد بن سلمة و ابن قتیبة و ابن بطة و قاضي ابو یعلی و ابن البناء ە .

بەڵام ئەوەی دروستە و قورئان و سوننەت دەلالەتی لێ کردووە و عاممەی سەلەفیش وتویانە، ئەوەیە کە مەبەست لە فیترەت لەم فەرموودەیە بریتیە لە ئیسلام، وە ئەمە دوو فەرموودەکە هەڵناوەشێنێتەوە لەبەرامبەر یەکتر، لەبەرئەوەی ئەو بەڵێن و پەیمانە بریتییە لە ئیسلام .

جا بەڵگە زۆرن لەسەر دروستی ئەم قسەیە، لەوانە :

١ - لەفزی ڕاشکاو هاتووە لەسەری کە فیترەت تەفسیرەکەی ئیسلام بێت، لەوانە : (هیچ لە دایك بوویەك نییە لە دایك بێت، ئیللا ئەو لەسەر ملة ە - ملة واتە دین - ) [رواه مسلم : ٦٨٥٣] .

یاخود : (هیچ لە دایك بوویەك نییە لە دایك بێت، ئیلا لەسەر ئیسلام لە دایك دەبێت، ..) [صحیح ابن حبان : ص ١٣٢]

٢ - پێغەمبەر ﷺ باسی ئەو حاڵەتانەی کرد لەوەی کە میللەتی کوفر فیترەتی منداڵ دەگۆڕن بۆ یەهودی و نەصرانی و ..هتد، بەڵام باسی ئیسلامی نەکرد، لەبەر ئەوەی منداڵ ئەو فیترەتەی هەبووە کە لەدایك بووە بەڵام ئەوان دەیگۆڕن بۆی .

٣ - لە المعجم الکبیری الطبراني هاتووە [٣٦٣/١٧] : (الله عزوجل ئادەم و نەوەکانی دوور لە شرك و کوفر و بە موسڵمانێتی دروست کردووە) .

ئەگەر چی لێرە قەدەرییەکانیش وتبێتیان فیترەت واتە ئیسلام، ئەوا پێچەوانەی ئەو بیروباوەڕەیە کە خۆیان لەسەرین، چونکە فەرمودەکە دەلالەت لەوە دەکا کە لەدایك بوو لەسەر ئیسلام لەدایك دەبێت، وە لای قەدەری ئەسڵەن کەس لەسەر ئیسلام لە دایك نابێت، جا مرۆڤ لەسەر ئیسلام بێ یان کوفر لای ئەوان ئەوەیە کە بە هەڵبژاردنی کەسەکە خۆی بووە .

وە لە لەفزێکی دیکەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (الله خۆی زاناترە بەوەی کە گەورە بن چی دەکەن) .

ڕەددێکە بۆ قەدەرییەکان چونکە ئەوان نەفی عیلمی الله یان دەکرد، جا فەرمودەکە بە ڕاشکاوانە إثباتی علم بۆ الله دەکا پاش ئەوەی کە لە دایك دەبن لەسەر فیترەت چییان لێ دێت .

بۆیە امام مالك وتویەتی : قەدەریەکان بە بەشی یەکەمی فەرموودەکە بەڵگە دێننەوە لەسەرمان، ئێوەش بە بەشی کۆتایی فەرموودەکە بەڵگە بێننەوە لەسەریان کە دەفەرمووێت : (الله خۆی زاناترە بەوەی کە گەورە بن چی دەکەن) .

لەبەر ئەمەیە کە پێشەوایان ڕوونیان کردووەتەوە کە ئەم فەرموودەیە هیچ حوججەیەکی تیا نییە بۆ قەدەریەکان بەسەرمانەوە .

جا ئەوەش کە وای کردووە ئەهلی سوننە جیاوازیان هەبێت لە مەبەست لە فیترەت لە فەرموودەکەی ابو هريرة :

١ - ئەوەیە کە قەدەریەکان بەڵگەیان پێ هێناوەتەوە بەوەی کە کوفر و تاوان بە قەدەری الله نەبێت، بەڵکو لە لایەن خەڵکی خۆیەوە، لەبەر ئەوەی لە دایك بوو لەسەر فیترەت لە دایك دەبێت، کوفر و تاوانیشی لە دوای ئەوە لە لایەن خۆیەوەیە .

٢ - شوبهاندنی حوکمەکانی دونیا بە حوکمەکانی قیامەت، جا کاتێك کە منداڵی کافران ئەو حوکمانەی دونیایان لەسەر جێبەجێ دەکرا کە لەسەر باوانیان جێبەجێ کراوە وەکو مافی ولایە و هەندێ شتی تر، وای لێهات هەندێ کەس وا گومانیان دەبرد کە منداڵانیشیان کافر بن بە هەمان شێوەی ئەو کەسەی کە کوفر دەڵێت و کاری کوفریش دەکا، وە ئەمە هەڵەیە لە بڕیارداندا، لەبەر ئەوەی لە دایك

بونیان لەسەر فیترەت نەفی ئەوە ناکا کە لە ئەحکامی دونیادا شوێنی باوانیان بکەون، چونکە دەکرێ کەسێکی موسڵمان لە وڵاتی کافراندا بژی و کە مردیش کەس نایشوات و نوێژی لەسەر ناکات، بەڵام لە قیامەتدا لە ئەهلی بەهەشتە، هەر وەکو چۆن دووڕووەکان لە دونیادا حوکمی موسڵمانانیان لەسەر جێ بەجێ دەکرێ، بەڵام لە قیامەتدا دەخرێنە چینی خوارەوەی ئاگر، جا بۆیە حوکمی قیامەت و دونیا لە یەکتر جیاوازن .



**١١٠** - وە ئەمە وتەی أبي عبدالله أحمد بن حنبل ە رحمه الله دەربارەی فیترەت کە : دان پێدانانە بەو بەڵێنەی لێ وەرگرتن کاتێك لە پشتی باوکانیان بوون .

: ڕوونکردنەوە لەسەر ئەثەری ١١٠ :

ابن البناء ئەم وتەیەی گەڕاندۆتەوە بۆ امام احمد ئەویش بە شوێنکەوتنی شێخەکەی واتە قاضي ابو یعلی، ئینجا ابن تیمیە ڕەددی داوەتەوە لە [درء التعارض ٢٧٧/٤] وتی :

القاضي وتی : وە إمام احمد چووە بۆ ئەم لێکدانەوەیە لە ڕیوایەتەکی المیموني دا، وتی : ئەو فیترەتەی کە یەکەم جار الله تعالی خەڵکی لەسەر دروستکرد .

المیمونی وتی : فیترەت دینە؟

إمام احمد وتی : بەڵێ .

قاضي وتی : جا مەبەستی احمد لە دین، ئەوەیە کە ئێمە باسمان کرد - واتە بەڵێنەکە - .

بۆیە ابن تیمیە بەدوای ئەوەدا وتی : احمد باسی لە بەڵێنی یەکەم نەکردووە، بەڵکو فەرمووی : فیترەتی یەکەم کە الله خەڵکی لەسەر دروستکردووە، کە بریتییە لە دین .

وە ابن قیم لە [احکام اهل الذمة ١٠٢٤/٢] وتویەتی : وە وتەکانی احمد لە وەڵامدانەوەی پرسیاری دیکە دەلالەت لەوە دەکا کە فیترەت لای ئەو بریتییە لە ئیسلام هەر وەکو چۆن محمد بن نصر لێی گێڕاوەتەوە کە کۆتا وتەی بووە .

١١١ - وە دەربارەی منداڵی موشریکەکان وتی : ئەوان شوێنکەوتەن بۆ باوانیان .

وە بەڵگەی هێناوەتەوە بە فەرموودەی :

١١٢ - خديجة بنت خويلد رضي الله عنها، کە وتی : یا رسول الله ﷺ، ئەو منداڵانەم کە لە هاوسەرە موشریکەکانم هەمبوون ئێستە لە کوێن؟

فەرمووی : (لە ئاگردان) .

وتی : بە بێ کردەوە؟

فەرمووی : (الله زانیویەتی کە ئەوان چی دەکەن - واتە کە گەورەبوون چی دەکەن - ) .

بەڵام ئەم فەرمایشتەی الله : ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿١٦٤﴾ ﴾ [الأنعام] .

مەبەستی : لە غەیری منداڵانە .

وە ئەمە وەکو پاراستنە بۆیان، نەك ئەوەی لێیان بگیرێت بە تاوانی غەیری خۆیان .

وە نابێت بڵێت : ئەوجا بۆ ئەوە دەچن کە لە عیلمی الله دا هەیە ئەگەر پێبگەیشتایە کوفری دەکرد، چونکە ئەوکات دەبوو بۆ منداڵی ئیمانداڕانیش هەمان شت بوترایە کە لە قەدەری دا هەیە .

وە نابێت بوترێت : ئەوان موسا و عیسا و محمد عليهم الصلاة و السلام ناناسن، جا چۆن کوفریان پێ دەکەن و بێ بڕوا دەبن پێیان، لەبەرئەوەی ثابت بووە لەسەریان بە حوکمی باوانیان جا ئەوان وەکو ئیمانداران و منداڵەکانیان وان، وە لە باقی تری مافەکانیشیان بە هەمان شێوە .

وە نابێت بوترێت : جا دەبوو ئەگەر لە پێش باوانیانەوە موسڵمان بووبان لێیان وەرنەگیرابا، وە دەبوو شوێنکەوتەیان بن، لەبەر ئەوەی بە تەسلیمبوونیان حوکمی ثابت ماتووە لەسەر نەفسی خۆیان، وە شوێنکەوتەیان نین .

: ڕوونکردنەوە لەسەر ئەثەری (١١١ - ١١٢) :

ابن تیمیە لە [درء التعارض ٣٩٧/٨ و ٣٩٨/٨] ئەوەی بەتاڵ کردووەتەوە کە لە امام احمد ماتبێت کە حوکمی منداڵی کافرانی دابێ کە لە ئاگردابن وتی :

ئەمما ثابت بوونی حوکمی کوفر بۆ منداڵان لە قیامەتدا، احمد دەمێك لێی دەوەستا لە وەڵامدانەوە و دەمێکیش وەڵامی دەدانەوە و دەیگەڕاندەوە بۆ عیلم، وەکو وتەکەی : الله زاناترە بەوەی چیان دەکرد .

وە ئەمە باشترین وەڵامیەتی، هەر وەکو ئەوەی محمد بن حکم نەقڵی کردووە لێیەوە، وە پرسیاری لێکرد دەربارەی منداڵانی موشریکەکان؟

إمام احمد وتی : بچۆ بۆ ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ : (الله زاناترە بەوەی چیان دەکرد) .

پاشان ابن تیمیە وتی : کەس لە احمد ەوە نەقڵی نەکردووە کە وتبێتی : ئەوان لە ئاگردان، بەڵام کۆمەڵێك لە شوێنکەوتوانی دوای خۆی وەك قاضي ابی یعلی و غەیری ئەو، کاتێك بیستیان وەڵامەکەی احمد بریتی بوو لە : الله زاناترە بەوەی چیان دەکرد .

وایان زانی ئەمە تەواوی فەرموودەکەیە کە لە خدیجەوە ڕیوایەت کراوە کە لە پێغەمبەر ﷺ پرسی دەربارەی منداڵەکانی لە غەیری پێغەمبەر ﷺ ، جا فەرمووی ﷺ : (ئەوان لە ئاگردان) .

وتی : بەبێ کردەوە؟

رسول الله ﷺ فەرمووی : (الله زاناترە بەوەی چیان دەکرد) .

جا ئەوان وایان زانی احمد بەو فەرموودەیە وەڵامی داوەتەوە، وە ئەمە هەڵەیە لەسەر ئەوەی احمد وای وتبێت، لەبەر ئەوەی فەرموودەکەی خدیجە فەرموودەیەکی موضوع و درۆیە و تەنانەت کەمترین کەسیش - واتە لە عیلمدا - کە هاوەڵێتی احمدی کردبێت بەڵگەی پێ ناهێنتەوە، ئەمە وەکو فەزڵێك بۆ إمام احمد .

پاشان ابن تیمیە وتی : بەڵام لە ڕاستیدا احمد پشتی بەستووە بە فەرموودە صحیحەکە کە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (هەموو لە دایك بوویەك لەسەر فیترەت لە دایك دەبێت، جا باوك و دایكی دەیكەن بە یهودی و نصرانی و مجوسی . . ) .

وە بەم شێوەیە لە الصحیح لە إبن عباس لە پێغەمبەر ﷺ کە پرسیاری لێکرا سەبارەت بە منداڵی موشریکەکان، فەرمووی : (الله زاناترە بەوەی چییان دەکرد) .

**١١٣ - وە ئەم مەسەلەیە پێچەوانەی موعتەزیلەیە، وتیان : نابێت بە ڕەهایی پێیان بوترێ لە ئاگردان .**

**١١٤ - وە پێچەوانەی ئەشعەرییەکانە، کاتێك وتیان : دەبێت بوەستین و توقف بکەین .**

---

ڕوونکردنەوە لەسەر ئەثەری (١١٣ - ١١٤) :

ابن تیمیە لە [درء التعارض ٤٣٦/٨] دەڵێت : وەستان [الوقف] بە سێ شت تەفسیر دەکرێت :

١ - ئەوەیە کە حوکمیان نازانرێت، جا قسە لەسەریان ناکرێت بە هیچ شێوەیەك، وە ئەمە وتەی کۆمەڵەیەکە کە گەڕێندراونەتەوە بۆ سوننەت، وە دەوترێت : وتەکانی احمد دەلالەت لەمە دەکات .

**٢** - ئەوەیە کە دەکرێت هەموویان بچنە بەهەشتەوە، وە دەشکرێت هەموویان بچنە ئاگرەوە، وە ئەمە وتەی کۆمەڵەیەکە لە ئەهلی کەلام و غەیری ئەوان لە هاوەڵانی ابی الحسن الاشعري .

**٣** - ئەو تەفصیلەی کە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ دەلالەتی لێکردووە : (اللە زاناترە بەوەی کە چییان دەکرد) .

جا هەر کەس اللە زانیبێتی کە ئەگەر گەورە بێ و پێ بگا ئەوا گوێڕایەڵی دەکا، دەیکاتە بەهەشتەوە، وە زانیبێتی هەر کەس سەرپێچی دەکا، دەیکاتە ئاگرەوە .

پاشان لەو کەسانەی کە دەڵێن : اللە پاداشتیان دەداتەوە تەنیا بە زانستەکەی لەبارەیانەوە .

وە زۆرینە دەڵێن : اللە پاداشتی کەس ناداتەوە بە علمەکەی کە چی ڕوودەدات هەتاوەکو شتەکە ڕوو نەدات، بۆیە تاقییان دەکاتەوە لە قیامەتدا، وە هەموو ئەوانەش تاقی دەکاتەوە کە دەعوەیان پێ نەگەشتووە لە دونیادا، جا هەر کەس لەوێدا گوێڕایەڵی بکات، دەچێتە بەهەشتەوە، وە هەر کەس سەرپێچی بکات، دەچێتە ئاگرەوە .

وە ئەم وتەیە نەقڵ کراوە لە غەیری تاکە کەسێك لە سەلەفەوە لە هاوەڵان و تابعین و غەیری ئەوان .



**١١٥** - ابن قتيبة وتى :

**١١٦** - وە دووبارە موعتەزیلە وتیان : ئەوەی ئێوە گێڕاوتانەتەوە لە :

**١١٧** - (اللّٰه مەسحی پشتی ئادەمی کرد، وە نەوەکانی لێ مێنایە دەرەوە تاکو ڕۆژی قیامەت بە نمونەی الذر، وە وای لێکردن شاهێدی لەسەر خۆیان بدەن : ئایا پەروەردگارتان نیم؟ - واتە اللّٰه ئەو پرسیارەی لە هەموویان کرد - وتیان : بەڵێ) .

پێچەوانەیە لەگەڵ ئەم فەرمایشتەی اللّٰه تعالى : ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ١٧٢﴾ [الأعراف] .

لەبەر ئەوەی فەرموودەکە دەڵێت : دەری مێناوە لە پشتی ئادەم .

بەڵام لە قورئانەکە دەڵێت : دەری مێناوە لە پشتی نەوەی ئادەم .

ابن قتيبة وتی : وە ئەمە هەڵەیەکە لەوانەوە، لەبەر ئەوەی کاتێك مەسحی پشتی ئادەمی کرد، وەچەکانی لێ دەرمێنا بە نمونەی الذر تاوەکو ڕۆژی قیامەت، جا لە ناو ئەو وەچانەدا : نەوەکانی هەن، وە نەوەکانی تا ڕۆژی قیامەت هەبوون، جا ئەگەر لە هەموو

ئەوان پەیمانی وەرگرتبێت، ئەوا لە نەوەی ئادەمی وەرگرتووە، وە ئەمە هەر وەکو فەرمایشتی الله تعالی یە : ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِءَادَمَ ﴿١١﴾ ﴾ [الأعراف] .

وە قبوڵ کراوە لەبەر ئەوەی کاتێك ئادەمی دروست کرد ئێمەشی لە پشتیدا دروستکردووە و ئامادەی کردووین، جا دروستکردنی ئادەمی کرد بە دروستکردنی ئێمەش .

---

: وشەی الذر زیاتر لە یەك واتای هەیە؛ وەکو : گەردیلە، مێروولە، . . . هتد. بەڵام ئەوەی کە لێرەدا زیاتر دەگونجێت مێروولەکەیە، والله اعلم .

## بەشێك

فەرموودەیەکی دیکە سەبارەت بە قەدەر : (ئادەم و موسا علیهما السلام احتجاجیان کرد)

١١٨ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئادەم و موسا احتجاجیان کرد - مناقەشەیان کرد - لای پەروەردگاریان عزوجل، ئینجا ئادەم بە بەڵگە بەسەر موسادا سەرکەوت .

جا موسا فەرمووی : ئەوە تۆی الله بە دەستی خۆی دروستی کردیت، وە فووی پێدا کردی لە ڕۆحی، وە وای لە مەلائیکە کرد سوجدەت بۆ ببەن، وە نیشتەجێی بەهەشتی کردیت، پاشان خەڵکیت دابەزاند بۆ سەر زەوی بە هۆی هەڵەکەی خۆتەوە.

ئادەم فەرمووی : ئەوە تۆ ئەو موسایەیت کە الله هەڵیبژاردوویت بە پەیامەکەی و کلامەکەی، وە لەوحەکانی - واتە تەورات - پێدایت کە ڕوونکردنەوەی هەموو شتێکی تێدایە، وە لەخۆی نزیکی کردیتەوە و قسەی لەگەڵدا کردی، جا بۆت دەرکەوت کە بە چەند ساڵ الله تەوراتی نوسیەوە پێش ئەوەی من دروست بکرێم؟

موسا فەرمووی : چل ساڵ .

ئادەم فەرمووی : تێیدا : ﴿ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ﴾ [طه] ـت دۆزیەوە؟

فەرمووی : بەڵێ .

فەرمووی : جا ئایا لۆمەم دەکەیت لەسەر ئەوەی کارێکم کردووە کە اللە پێش چل ساڵ لە دروست بوونم نوسیویەتی لەسەرم؟) .

رسول اللە ﷺ فەرمووی : (ئەوجا ئادەم زاڵ بوو بەسەر موسادا - واتە بەڵگەی ئادەم بەهێزتر بوو - ) .

ابو الفتح الحافظ رحمە اللە وتی : ئەم فەرموودەیە فەرموودەیەکی صحیحە مسلم دەریهێناوە لە إسحاق بن موسى بن عبداللە الأنصاري ەوە، لە ابي ضمرة ەوە .

بە سەنەدێکی عالی گەیشتووەتە دەستمان.

وەکو بڵێی شێخەکەمان بۆی باسکردبێتین : لە مسلم ەوە رحمە اللە .



## بەشێك

**١١٩** - ابن قتيبة وتی :

**١٢٠** - موعتەزیلە وتیان : ئەمە دەلالەت لەوە دەكات كە موسا قەدەری بووە .

وتمان : ئێمە دەزانین هەموو شتێك بە قەزا و قەدەری الله یە، جگە لەوەی كە كردارەكان دەگەڕێنینەوە بۆ بكەرەكانیان، ئەوجا سوپاسی چاكەكار دەكەین لەسەر چاكەكەی، وە لۆمەی خراپەكار دەكەین لەسەر خراپەكەی .

**١٢١** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەر كەسێك بڕوای بە قەدەر نەبێت بە خێر و شەڕییەوە، ئەوە لە من بەرییە، وە منیش لەو بەرییم) .

---

: ئەم فەرموودەیە والله اعلم ضعیفە، بەڵام بەری بوون لەوانەی بڕوایان بە قەدەر نیە بە صحیحی لە ابن عمرەوە هاتووە رضي الله عنه .

# باب : ١٢

# ئیمان هێنان بەوەی کە قورئان کەلامی الله ـیە و مەخلوق نییە



١٢٢ - هارون بن عبدالرحمن العكبري بۆی باس کردین، وتی : پرسیارم لە احمد بن حنبل کرد کاتێك گەیشتە عکبری لە دوکانی ملیح، وتم : ئەی باوکی عبدالله، قورئان کەلامی الله یە و مخلوق نییە، لەوەوە دەستی پێکردووە و هەر بۆ ئەویش دەگەڕێتەوە؟

وتی : لەوەوە دەستی پێکردووە : واتە عیلمەکەی .

وە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە : واتە حوکمەکەی .

١٢٣ - أبو عبدالله بن حامد رحمە الله وتی : لەوەوە عیلمەکەی دەستی پێکردووە بۆ ئێمە، وە حوکمەکەی بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، هەروەکو چۆن زانست بۆ زاناکەی دەگەڕێتەوە، وە ئەمر بۆ ئامرەکەی، وە خەلقیش بۆ خالقەکەی،

وە گەڕانەوە بەو مانایە نییە : کە لێی جیابووبێتەوە جا بگەڕێتەوە بۆی پاش جیابوونەوە، بەڵکو گەڕانەوە لەسەر حەدی مەبەستی زانستەکانە کە هەمووی

دەگەڕێتەوە بۆ الله تعالى، وە قورئان لەناوناچێت بە لەناوچوونی دروستکراوەکان، لەبەر ئەوەی سیفەتی زاتییەتی .

---

: ابن تيمية لە (مجموع الفتاوى ١٢/٢٧٤) دەڵێت : وتەی سەلەف دەربارەی ئەوەی کە دەڵێن : (لەوەوە دەستی پێکردووە)، مەبەستیان ئەوە نییە کە لە زاتی الله جیا بوویێتەوە، و تێکەڵی غەیری خۆی بووبێ، چونکە کەلامی مەخلوق و بەڵکو باقی سیفەتەکانی تری لێی جیا نابنەوە، وە دەگوازرێتەوە بۆ غەیری خۆی، جا کەواتە چۆن دەکرێ کەلامی الله لە زاتی خۆی جیابێتەوە، یاخود سیفەتەکانی دیکەی لە غەیری کەلام، بەڵکو وتیان : (لەوەوە دەستی پێکردووە) واتە : الله قسەی بە قورئان کردووە، ئەمەش ڕەددێکە بۆ موعتزیلە و جەهمی و جگە لەوانەش کە وتیان : ئەو قورئانە لە مەخلوقەکانیەوە دەستی پێکردووە کە خۆی دروستی کردوون .

**١٢٤** - صالح بن أحمد بن حنبل رحمهما الله بۆی باسکردین : وتی گوێم لە باوکم بوو دەیوت :

جەهمییەکان دابەش بوون بۆ سێ کۆمەڵە :

أ - کۆمەڵەیەك وتیان : قورئان مەخلوقە .

ب - وە کۆمەڵەیەك وتیان : کەلامی الله یە و بێدەنگ بوون .

ج - وە کۆمەڵەیەك وتیان : لەفزمان بە قورئان مەخلوقە .

## بەشێك

**١٢٥** - موعتەزیلە وتیان : ئەو مەخلوقە - واتە قورئان - .

**١٢٦** - بەڵگەمان :

فەرمایشتی الله تعالی یە : ﴿ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۝٥٤ ﴾ [الأعراف]، ئەوجا لە یەکی جیاکردنەوە - واتە خەلق و فەرمانەکەی لە یەکتر جیاکردەوە - .

وە فەرمووی : ﴿ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦ ۝٢٥ ﴾ [الروم]، وە بە مخلوق ڕاناوەستن .

وە فەرمووی : ﴿ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ۝٢٧ ﴾ [لقمان]، وە مەخلوق تەواو دەبێت و کۆتایی دێت .

وە فەرمووی : ﴿ إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَىْءٍ إِذَآ أَرَدْنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ۝٤٠ ﴾ [النحل]، خۆ ئەگەر مەخلوق بوایە ئەوا جیادەبۆوە بۆ لەفزی دووەم، پاشان بۆ ئەوەی کە کۆتایی بۆ نییە .

**١٢٧** - جا ئەگەر وترا - واتە لە لایەن موعتەزیلەوە - :

که الله فەرموویەتی : ﴿ إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا ﴿٣﴾ ﴾ [الزخرف]، وە وشەی کردن [الجعل] بە مانای خەلق کردن دێت .

وە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ ﴿١﴾ ﴾ [القدر] وە دابەزێنراو تازەیە .

دەوترێت - لە وەڵامدا - : وە کردن [الجعل] دەکرێت بە مانای ناو لێنان، و حوکمیش بێت، هەروەکو فەرموویەتی : ﴿ وَجَعَلُواْ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَٰدُ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنَٰثًا ﴿١٩﴾ ﴾

[الزخرف]، واتاکەی : ناویان لێنان مێینە .

وە ئەمما دووەم : ڕێگر نیە لەوەی بەگشتی لەڕویەکەوە بەرەو گواستنەوە و شوێن گۆڕین نەیەت، هەروەکو الله تعالی فەرموویەتی : ﴿ وَهُوَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِى ٱلْأَرْضِ ﴿٣﴾ ﴾ وە ئەوە پێویستی ناکات لای ئەوان کە لە شوێندا بێت .

---

: مەبەستیان ئەوەیە الله شوێنی نیە وە انتقال ناکات واتە دانابەزێت و بەرزەوە نابێت، جەهمیەکان ئەم ئایەتە دەکەنە دەلیل کەوا الله تعالی بەرز نابێتەوە بەسەر درووستکراوەکانی والعیاذ بالله، هەروەکو امام احمد رحمه الله لە (الرد على الزنادقة والجهمية ص٣٧) لە مانای فەرمایشتی الله : ﴿**وَهُوَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِى ٱلْأَرْضِ**﴾ دەڵێت : الله پەرستراوی هەموو ئەوانەیە لە ئاسماندایە، وە پەرستراوی ئەوانەشە لەزەویدایە، وە الله لەسەر عەرشە، وە زانستی هەیە بە هەر چی لەبێجگە عەرشەوەیە، وە هیچ شوێنێك خاڵی نییە لە زانستی الله تعالی، وە ناکرێت زانستی الله تعالی لە شوێنێك هەبێت و لە شوێنیکی تر نەبێت .

**١٢٨ - جا ئەگەر وترا** - واتە ئەگەر موعتەزیلە ئەم ئایەتەیان خوێندەوە - : ﴿ مَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّن رَّبِّهِم مُّحۡدَثٍ ۝٢ ﴾ [الأنبياء] .

**دەوترێت : قورئان بۆ ئێمە تازەیە** - واتە پێشتر نەماندەزانی و لێی غافڵ بووین - ؛ **چونکە وشەی یاد - الذکر - چەند شتێك دەگرێتەوە، لەوانە :**

**قورئان ، پێغەمبەر، بە بەڵگەی فەرمایشتی الله :** ﴿ذِكۡرٗا ۝١٠ رَّسُولٗا ۝١١﴾ [الزخرف]

**وە نوێژیش، بە بەڵگەی فەرمایشتی الله :** ﴿ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ ۝٩ ﴾ [الجمعة]، **ئێمە بۆ غەیری قورئان دەچین لە تەفسیری ئەم ئایەتە .**

---

: واتە لێرەش وشەی [ذکر] هاتووە و تەفسیرەکەشی قورئان نییە لێرەدا، جا لە ئایەتی دووەمی سورەتی الأنبياء دەکرێ وشەی [ذکر] مەبەستی قورئان نەبێ خۆ ئەگەر مەبەستیشی قورئان بێ ئەوا دەوترێ لای ئێمە تازەیە چونکە پێشتر نەماندەزانی، ئەگەر نا الله لە ئەزەلەوە زانیویەتی و لە سیفەتی خۆی بووە .

**وە لەبەر ئەوەی کە فەرموویەتی :** ﴿مِنۡ﴾ **کە بۆ بەشکردن بەکاردێت، وە لەبەر ئەوەش کە هیچ کام لە یادەکان کە لای ئێمە غەیری مەخلوق بێ لای ئەوان بوونی نییە** - واتە هەموو شتێك بە [ذکر] هاتبێ لای ئەوان مەخلوقە بەس لای ئێمە وانییە - .

**وە قورئان مەخلوق نییە، ئەمەش ڕاستیە کە ئێمە وەرمانگرتووە .**

## بەشێك

**١٢٩** - وە كلامەكەی مەوجود نییە لە ناو دروستكراوەكانیدا، وە تێكەڵیشیان نابێت، بە پێچەوانەی حلولییەكان و گاورەكان .

: مەذمەبی حلولییەكان ئەوەیە كە بڕوایان بە وحدة الوجود مەیە دەڵێن الله لە مەموو شتێك و شوێنێك مەیە و مەموو كلامێك كە بوونی مەیە كلامی الله یە، بەڵام خۆی وانییە، الله جیایە لە مخلوقەكانی، وە كلامی الله جیایە لە كلامی دروستكراوەكانی .

**١٣٠** - وە أحمد لە پێشەكی «الرسالة» دا وتویەتی :

كەلامی الله جودا نییە لە خۆی، چونكە حلول وای دادەنێن جودایی مەبێت - بەوەی كەلامی الله لەخۆی جیایە، پەنا بە الله - .

: ابن تیمیة لە (مجموع فتاوی - ١٢ / ٣٩٠ و ٥١٧) دەڵێت : احمد بن حنبل وتی : (كلامی الله لە الله وەیە، وە لە الله جودا نییە)، وە ئەمە واتای ئەو قسەیەی سەلەفە كە دەڵێن : (قورئان كەلامی الله یە، لەوەوە دەستی پێكردووە، وە لەوەوە دەرچووە، وە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە) ... وە مانای ئەم وتەیەی سەلەف و پێشەوایان كە دەڵێن : (لەوەوە دەرچووە، و لەوەوە دەستی پێكردووە) ئەوە نییە كە كەلامەكەی لە زاتی خۆی جودا بووبێتەوە، لەبەرئەوەی كەلامی مەخلوق كاتێك كە مەخلوق قسەی پێ دەكات لە خۆی

جیانابێتەوە ناچێتە یەکێکی ترەوە، ئەوجا - ئەگەر کلامی مەخلوق وابێت - کەلامی الله چۆن جیا دەبێتەوە - لە زاتی خۆی - ؟

الله تعالى فەرموویەتی : ﴿كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ﴾ [الكهف]، جا ڕایگەیاندووە کە وشەکە لە دەمیان هاتووەتە دەر، وە لەگەڵ ئەمەشدا لە زاتی خۆیان جودا نەبووەتەوە.

١٣١ - وە لە ڕیوایەتی عبدالله وتویەتی : قورئان کەلامی الله یە، نایەت، وە لە حاڵەتێکەوە ناگۆڕێت بۆ حاڵەتێکی دیکە .

١٣٢ - وە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی : (البقرة دێت) واتە : پاداشتەکەی .

چونکە بە ڕاشکاوی وتویەتی کە جیا نابێتەوە لە زاتەکان، وە حلولیەکان ڕاست ناکەن - کە دەڵێن کەلامی الله لە الله جیادەبێتەوە - .

: ئەم ئەثەرە بە تەفاصیل ڕوونکراوەتەوە لە ئەثەری ١٦١ .




**١٣٣ - وه کەلامەکەی لە کەلامی مخلوقەکانی ناچێت، پێچەوانەی موشەبیهەکان .**

**وه ئەو جەستە نییە، پێچەوانەی النظام .**

**وه الله جسم نییە و پانتایی نییە .**

---

: ڕوونکردنەوە لەسەر ئەثەری ١٣٣ :

ئەم قسانە سەلەف بەکاریان نەهێناون نابێت ئێمەش بە هیچ شێوەیەک بەکاریان بهێنین، واتە نە نەفییان دەکەین نە إثبات، چونکە ئەم دەستەواژانە هیچ کەس لە سەلەف بەکاریان نەهێناوە. .




**١٣٤** - وە نوسین - كتابة - : بریتییە لە نوسراو - مكتوب - .

**١٣٥** - أبو أحمد الأسدي وتی : چوومە ژوورەوە بۆ لای أبي عبدالله أحمد بن حنبل، وە لێم پرسی : لەفزم بە قورئان مخلوقە، یان مخلوق نییە؟

وتی : قورئان دابەش بووە بۆ سەر پێنج ڕوو : لەبەركردن بە دڵ، وە خوێندنەوە بە زمان، وە بیستن بە گوێ، وە بینین بە چاو، وە نوسین بە دەست،

جا دڵ مخلوقە، وە لەبەركراو مخلوق نییە،

وە زمان مخلوقە، وە خوێندراو مخلوق نییە،

وە گوێ مخلوقە، وە بیستراو مخلوق نییە،

وە بینین مخلوقە، وە بینراو مخلوق نییە،

وە دەست مخلوقە، وە نوسراو مخلوق نییە .

وتم : چاو دەڕوانێت بۆ ڕەشایی لە كاغەزدا؟

فەرمووی : بەسە! دروستترین شتی تێدایە : فەرموودەی نافع، لە ابن عمر ـەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (كە سەفەر دەكەن قورئان مەبەن بۆ زەوی دوژمن) .

وە باسی حیبر و کاغەزی نەکرد .

: ڕوونکردنەوە لەسەر ئەثەری (١٣٤ - ١٣٥) :

**ئاگاداری :** ئەو قسەیانەی کە نووسەر لە بابەتی لەفزدا دەیکات نەهیلێکراوە، وە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوەیە کە لەم بابەتەدا قسە نەکرێت، وە قورئان بە هەموو شێوازێک غیر مخلوق ە، وە کردەوەکانی مرۆڤیش بە هەموو شێوازێک مخلوق ە.

: ئیمام أَبُو سَعِيدٍ عثمان بن سَعِيد الدارمي رَحِمَهُ اللَّهُ ئەڵێت : وَجَدْنَا الْأَشْيَاءَ كُلَّهَا شَيْئَيْنِ: الْخَالِقُ بِجَمِيعِ صِفَاتِهِ، وَالْمَخْلُوقِينَ بِجَمِيعِ صِفَاتِهِمْ، فَالْخَالِقُ بِجَمِيعِ صِفَاتِهِ غَيْرُ مَخْلُوقٍ، وَالْمَخْلُوقُ بِجَمِيعِ صِفَاتِهِ مَخْلُوقٌ . الرد على الجهمية : ص - ١٩٣

: بۆمان دەرکەوت هەموو شتەکان دوو جۆر و شتن : خالق بە هەموو سیفەتەکانیەوە، وە مەخلوق بە هەموو سیفەتەکانیەوە، جا خالق بە هەموو سیفتەکانیەوە غیر مخلوق ە، وە مەخلوق بە هەموو سیفەتەکانیەوە مخلوق ە.

ورد ببەرەوە لە وتەی ئیمام الدارمي رحمه الله، الله تعالى و هەموو ناو و سیفەتەکان و فیعلەکانی غیر مخلوق ن، مەخلوقاتیش وەکو مەلائیکە و مرۆڤ و جن ... هتد خۆیان و هەموو شتێکیان مەخلوق ن، ئەوەی لەسەر تۆیە تەنها زانینی ئەمەیە و بەس.

دووبارە نوسەر لەم بابەتەدا نەیپێکاوە کە وتویەتی : نوسین بریتییە لە نوسراو، لەبەر ئەوەی مەزهەبی ئەهلی فەرموودە بریتی بووە لە جیاکردنەوەی کردەوەی عبد کە مەخلوقە لەگەڵ قورئانەکە کە مخلوق نییە، جا ڕۆچوون لەم بابەتەدا باش نییە.

هەر وەکو لەم گێڕانەوەیە هاتووە و لە ڕوونکردنەوەی ئەثەری ١٣٦ ڕوونتر کراوەتەوە .

عبدالله بن المهاجر (٢٥٨ ھ) هاوەڵی امام احمد دەڵێ : الاثرم و ابو عبدالله المعيطي داوايان لێكردم كە داوای قسەكردن لەگەڵ ابو عبدالله - واتە امام احمد - بكەم بە تەنيا، جا لێی بپرسم دەربارەی ئەو هاوەڵانەمان كە جياكاری دەكەن لە نێوان لەفز و گێڕدراوە، ئەوجا منيش لێيم پرسی، فەرمووی : قورئان لە هەر حاڵەتێكدا بێت لە وتە و كردەوەدا ئەوا مەخلوق نييە، وە كردەوەكانی ئێمە مەخلوقن (السير ٢٩١/١١) .

بۆ تێگەيشتن لە مەزهەبی لەفزيەكان دەتوانن پۆستەكانی ئەم كەناڵە بخوێننەوە :

https://t.me/Lafziakan001/26

## ١٣٦ - بە پێچەوانەی ئەشعەرييەكانەوە لە وتەكەياندا كە دەڵێن :

تيلاوە بريتی نيە لە مەتلو، وە تازە و مخلوقيشە، وە نوسينيش بە هەمان شێوە .

كۆتا هەواڵی يەكەم لەم نوسخەيەدا، تيلاوەی دەكات و دەيخوێنێتەوە ان شاء الله و بە توانا و هێزی الله . لە دووەم دانەدا : وە بەڵگەمان : فەرمايشتی الله تعالى يە كە هەواڵ دەدات دەربارەی قورەيش : ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا قَوۡلُ ٱلۡبَشَرِ ٢٥﴾ [المدثر] .

---

: ڕوونكردنەوە لەسەر ئەثەری (١٣٦) :

ئايا تيلاوە هەر مەتلوە يان جگە لەوە؟

وە ئايا كتابة بريتيە لە مكتوب يان جگە لەوە؟

جا ئەم مەسەلەيە جيدال زۆر تێيدا درێژەی كێشاوە .

جا کۆمەڵەیەك وتیان : تیلاوەکردن [التلاوة] هەر تیلاوەکراوە [المتلو]، وە نوسین [کتابة] هەر نوسراوە [مکتوب]، واتە لەلای ئەوان هەردوو شتەکە یەکێکە و جیاوازی نییە، وە ئەمە مەزهەبی السجزي و ابن حامد و ابن منده غەیری ئەوانیش بووە، جا ئەمانە دەرۆیشتن بۆ ئەو قسەیەی کە دەڵێن : (لەفزمان بە قورئان مەخلوق نییە)، وە ئەم قسەیەیان بۆیە کرد چونکە هەڵە تێگەیشتن لە امام احمد کاتێك کە وتی : (ئەوەی بڵێت لەفزم بە قورئان مەخلوقە، ئەوا جەهمییە) .

ئەگینا ئەوانیش دەیانزانی کە دەنگی عەبد و دەم جوڵاندنی و خوێندنەوە و نوسینەوەی بریتیە لە کردەوەی بەندەکە و مەخلوقە، نەك بڵێن ئەو دەنگەی گوێیان لێ دەبێ دەنگی الله یە بۆیە وتبێتیان مەخلوق نییە .

ئینجا ابن البناء بە هەمان شێوە ئەم مەزهەبەی هەڵبژاردووە، وە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە لەم بابەتەدا ئەوەیە کە هیچ نەوترێت .

کۆمەڵەی دووەم کە وتیان : (تیلاوە مەتلو نییە، وە کتابة مکتوب نییە) .

ئەوانیش دوو کۆمەڵەن :

١ - کۆمەڵەیەک لە ئەهلی سوننە .

٢ - ئەشعەرییەکان و کوللابییەکان .

جا ئەشعەری و کوللابییەکان : مەبەستیان لە وتنی : (تیلاوەکردن [التلاوة] مەخلوقە)، مەبەستیان ئەم قورئانەی سەر زەوییە کە ئەم قسەیە هەمان وتەی جەهمیەکانە، وە کە دەشڵێن تیلاوەکراو [المتلو] مەخلوق نییە مەبەستیان کەلامی نەفسیی الله یە، چونکە لای ئەوان ئەو قورئانەی کە لەسەر زەوی هەیە هەمان شت نییە لەگەڵ ئەو قورئانەی کە الله لە سەرووی ئاسمانەکان بە عەرەبی قسەی پێکردووە، بەڵکو لای ئەوان ئەم قورئانەی سەر زەوی بریتییە لە حکایەت و عیبارەتێك لە قورئانەکەی ئاسمان، بۆیە ئەم قسەیە کوفرە چونکە نەفی ئەوە دەکات کە الله بە دەنگ و بە پیت قسەی کردبێت، ئینجا ئەم ئەشعەری و کوللابییانە خۆیان دەدەنە پاڵ امام البخاري کە گوایە شوێنی ئەو کەوتون بەڵام ئەو لەمان بەرییە .

ئەمما ئەوانەی لە ئەهلی سوننە قسەیان کردووە لەم بابەتەدا کردەوەی بەندە [واتە تلاوة و کتابة و قراءة] جیا دەکەنەوە لە قورئانەکە [متلو و مکتوب و مقروء] .

هەر وەکو ابن القیم لە [مختصر صواعق المرسلة (١٣٤٠ - ١٣٤١)] ڕوونیدەکاتەوە : ئەوانەی ووتیان تیلاوە جیایە لە مەتلو دوو کۆمەڵەن :

یەکەم ووتیان : تیلاوە بریتیە لەو پیت و دەنگانەی کە ئەبیسترێن ئەویش مەخلوقە، ئەمەش ووتەی ئەشعەریەکانە .

وە کۆمەڵەی دووەم ووتیان : تیلاوە بریتیە لە خوێندنەوەمان و دەربڕینمان بە قورئان، وە مەتلو بریتیە لە قورئانی عەزیز ئەبیسترێت بە گوێیەکان بە ئەدا کردنی لە دەمی رسول الله ﷺ کە بریتیە لە: ﴿الٓمٓصٓ﴾ و ﴿كٓهيعٓصٓ﴾ و ﴿حمٓ﴾ و ﴿الٓمٓ﴾ کە بریتین لە پیت و ووشە و ئایەت کە جبریل بەسەریدا خوێندوویەتیەوە، وە پێغەمبەر ﷺ خوێندوویەتیەوە بەسەر ئوممەت هەروەك ئەوەی جبریل بەسەریدا خوێندوویەتیەوە، وە جبریل یش علیە السلام لە الله وە گەیاندوویەتی وەك ئەوەی بیستوویەتی، ئەمەش ووتەی سەلەف و پێشەوایانی سوننەت و فەرموودەیە، ئەوان جیاکاری دەکەن لە نێوان ئەو شتەی کە عەبد ئەنجامی داوە و ئەو شتەی کە پەروەردگار ئەنجامی داوە، لەلایان قورئان هەر هەمووی کەلامی الله یە پیتەکانی و ماناکانی، وە دەنگی بەندەکان و جوڵەکانیان و ئەدا کردنیان و تەلەفوزیان هەمووی مەخلوقن جیانە لە زاتی الله.

لێرەوە قسەکانی ابن قیم تەواو بوو، ئەوەی لەسەرمانە ئەوەیە کە بزانین کردەوەی بەندە هەموو کات مەخلوقە و قورئانیش لە هەموو حاڵەتێکدا غەیری مەخلوقە، وە سەلامەترین شت ئەوەیە کە نەچینە تەفاسیلی تیلاوە و متلو و قرائە و مقروء و کتابە و مکتوب، تەنیا بوترێت قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نییە .

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

**١٣٧** - وه بەڵگەمان :

هەواڵ پێدانی الله یه لە بارەی قورەیشەوە : ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا قَوۡلُ ٱلۡبَشَرِ ٢٥ سَأُصۡلِيهِ سَقَرَ ٢٦﴾ [المدثر]

وە زانراوە کە ئەوان ئاماژەیان بەو تیلاوەکردنە دەکرد کە دەیان بیست لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیەوە جا کاتێك پەیمانیان لەسەری بەست، دەلالەتی کرد لەوەی کە ئەوە وتەی مرۆڤ نییە .

**١٣٨** - وە جابر رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە و وتویەتی : پێغەمبەر لە حەجدا ﷺ خۆی نیشانی خەڵکی دەدا و دەیفەرموو : (ئایا کەسێك هەیە من ببات بۆ لای خزمان و کەسانی خۆی، چونکە قورەیش ڕێگریان لێ کردووم کە کەلامی پەروەردگارم بگەیەنم) وە زانراوە کە ئەو تیلاوەکردنەکەی دەگەیاند، کەچی ناویشی نا : کەلامی پەروەردگاری .

کە ئەمە دەلالەت دەکات لەوەی نوسین نوسراوەکەیە - كتابة مكتوبة - بە بەڵگەی فەرمایشتی الله تعالى : ﴿إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ٧٧ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ٧٨﴾ [الواقعة] جا الله ڕایگەیاند کە قورئان لە ناو کتێبدایە .

و لای ئەوان - واتە قورەیش، والله اعلم - : نوسین هەیە کە تازەیە، لە کتێبدایە .

: ڕوونکردنەوە لەسەر ئەثەری (١٣٧ - ١٣٨) :

پێشتر باسمان کرد کە ابن البناء نەیپێکاوە و ئەم وتانەش جیاوازە لەگەڵ وتەکانی ئەهلی فەرموودە، وە نابێت قسە لەم بابەتەدا بکرێت و تەفسیل و ڕۆچوون لەم بابەتەدا بکرێت، واتە نابێت بڵێیت لەفزم بە قورئان مخلوق ە، وە نابێیت بڵێیت لەفزم بە قورئان غیر مخلوق ە، وە نابێت بڵێیت کتابة مکتوب ە، وە نابێیت بڵێیت کتابة مکتوب نییە، ئەوەندە بزانە کە قورئان لە هەموو بار و شێوازێکدا کەلامی الله یە و غیر مخلوق ە، وە کار و کردەوەی مرۆڤ لە هەموو حاڵەتێکدا مخلوق ە.




**١٣٩** - وە کەلامی الله دابەزێنراوە لەسەر حەقیقەت بۆ سەر دڵی پێغەمبەر ﷺ، وە غەیری ئەویش لە پێغەمبەران، نەك دابەزین بە گواستنەوە لە شوێنێکەوە .

**١٤٠** - أحمد نەصی هەیە لەسەری - واتە لەسەر ئەوەی کە لە ئەثەری ١٣٩ هاتوە، ئیمام احمد قسەی کردووە دەربارەی - .

**١٤١** - وە بە پێچەوانەی ئەشعەریەکانەوە، کە دەڵێن : عیبارەتەکەی، و تیلاوەکەی، و تێگەشتنەکەی، و زانستەکەی دابەزیوە .

---

: وەکو پێشتر باسمان کرد کە ئەشعەرییەکان پێیان وایە ئەو قورئانەی ئاسمان بە حەقیقەت دانەبەزیوە بەڵکو عیبارەتەکەی دابەزیوە، وە پێیان وایە ئەم قورئانە عەرەبییە وتەی پێغەمبەر ﷺ یان جبریلە، پەنا بە الله تعالى .

هەر وەکو اللالکائي لە [اعتقاد اهل السنة - ٣٣٠/٢] دەڵێت : سیاق ئایەتەکانی کتێبی الله و ئەوەش کە گێڕدراوەتەوە لە رسول الله ﷺ و ماوەڵانی، وە تابعینیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی الله قسەی بە قورئان کردووە بە حەقیقەت، وە دایبەزاندووەتە سەر محمد ﷺ، وەفەرمانی پێکردووە تەحەددای کافرانی پێ بکا، وخەڵکی بۆ بانگ بکا، وە ئەوە قورئانە لەسەر حەقیقەت، تیلاوەکراوە لە میحرابەکان، نوسراوە لە موصحەفەکان، حفظ کراوە لە سینگی پیاوان، جا حیکایەت و عیبارەت نییە لە قورئان، وە ئەوە یەك

قورئانە و مخلوق نییە .. هەر كەس جگە لەمە بڵێ ئەوا : كافرە، گومڕایە، گومڕاكەرە، مبتدعە، پێچەوانەكاری مەزهەبەكانی ئەهلی سوننە و جەماعەیە.

**١٤٢** - وە بەڵگەمان :

فەرمایشتی الله تعالى یە : ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ ﴾ [الشعراء]

**١٤٣** - وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (قورئان دابەزیوە لەسەر حەوت پیت، هەموویان كافی و چارەسەرن) .

---

: والله اعلم، (حەوت پیت) تەفسیری جیاوازی بۆ كراوە، بەڵام یەكێك لەوانە مەبەستی حەوت زمان و شێوەزاری عەرەبە .



## بەشێك

**١٤٤** - وە كەلامی الله تعالى دەبیسترێت لەو كاتەی كە قورئان خوێنەكە دەیخوێنێتەوە، وە بیستنەكەی لە قورئان خوێنەكەوە دەبێت؛ أحمد نەصی لەسەر ئەم قسەیە هەیە .

---

: ابن قیم دەڵێت : احمد نەصی هەیە بە ڕیوایەتێك لە كۆمەڵێك لە هاوەڵەكانیەوە كە دەنگەكە دەنگی بەندەیە، جا احمد لە بارەی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ : (لە ئێمە نییە ئەوەی كە قورئان بە ئاواز نەخوێنێتەوە) .

وتی : واتە دەنگی بەرز دەكاتەوە لە كاتی خوێندنەوە، وە قورئانەكە جوان دەكات بە دەنگی خۆی بە گوێرەی توانای .

وە پێشەوایانی وەكو البخاري و جگە لەوان رحمهم الله نەصیيان لەسەر ئەم مەسەلەیە هەیە .

ئینجا ابن قیم باسی لە نوسینی كتێبی [خلق افعال العباد] ی كرد لە لایەن البخاري ەوە نوسراوە، پاشان وتی : البخاري ئەم كتێبەی لەسەر ئەساسی ئەوە نوسیوە كە دەنگی بەندەكان لە كردەوەی بەندەكانە، یاخود سەرچاوەكەی لە كردەوەكانیانەوەیە، كەواتە لە كردەوەی بەندەكانە، جا دەنگەكە دەنگی بەندەیە بە حەقیقەت، وە كلامەكەش كەلامی الله یە بە حەقیقەت، بەندە ئەدای كەلامی الله دەكات بە دەنگی خۆی هەر وەك چۆن ئەدای وتەكانی پێغەمبەر ﷺ و كەسانی تریش دەكات بە دەنگی خۆی، جا بەندە مەخلوقە، وە سیفەتەكانیشی مەخلوقە، وە كردەوەكانیشی مەخلوقە، وە دەنگەكەی و

تیلاوەکردنەکەشی مەخلوقە، وە ئەو مەتلوەی کە ئەدا کراوە بە دەنگ - واتە قورئان - مەخلوق نییە (مختصر الصواعق: ١٣٣١/٤).

**١٤٥** - بە پێچەوانەی ابن الباقلاني کە پێی وایە: کەس کەلامی الله ی نەبیستوە ئیللا کەسێك نەبێت کە ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ الله کردبێت، وەك موسا و پێغەمبەری خۆمان علیهما الصلاة و السلام.

---

: ابن الباقلانی: ابو بکر محمد بن الطیب المتکلم، پێشەوای ئەشعەریەکان بووە لە سەردەمی خۆیدا کە لە (٤٠٣هـ) بە میلاکدا چووە.

السجزي لە [رسالته في الحرف والصوت (ص ٢٢٣)] دەربارەی باقلانی دەڵێت: نەفی پیت و دەنگی کردووە، وە استواء ی تەئویل کردووە، وە جگە لەمانەش.

**١٤٦** - وە بەڵگەی ئێمە:

فەرمایشتی الله تعالی یە: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ﴿٦﴾﴾ [التوبة]

وە فەرموویەتی: ﴿يَسْمَعُونَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ ﴿٧٥﴾﴾ [البقرة]

وه فه‌رموویه‌تی : ﴿ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ۝١ ﴾ [الجن]

وه فه‌رموویه‌تی : ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ ۝٢٠٤ ﴾ [الأعراف]

ئه‌مه به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه قورئان ده‌بیسترێت له غه‌یری ئه‌و كه‌سه‌ی كه ڕاسته‌وخۆ قسه‌ی له‌گه‌ڵ الله كردووه له موسڵمانان و موشریكه‌كانیش - واته هه‌م موسڵمان و هه‌م كافریش ده‌یبیستێت - .

**١٤٧** - به پێچه‌وانه‌ی ئه‌و كه‌سه‌ی له سالمییه‌كانه كه ده‌ڵێت : ده‌یبیستێت له الله تعالى وه .

---

: سالمییه‌كان بڕوایان وایه ئه‌و ده‌نگه‌ی ده‌بیسترێت له قورئان خوێنه‌وه ده‌نگی الله یه نه‌ك ده‌نگی قورئان خوێنه‌كه، جا ده‌نگ لای ئه‌وان مه‌خلوق نییه هه‌ر وه‌ك چۆن قورئان مه‌خلوق نییه، به‌ڵام ئه‌مه هه‌ڵه‌یه چونكه ده‌نگه‌كه ده‌نگی به‌نده‌یه و مه‌خلوقه به‌ڵام به‌نده به ده‌نگه مه‌خلوقه‌كه‌ی كه‌لامی الله ئه‌دا ده‌كات كه مه‌خلوق نییه .

**١٤٨** - وه هه‌روه‌ها ئه‌وه‌ش كه عمار بن یاسر رضي الله عنه گێڕاویه‌تیه‌وه، له پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ كه فه‌رموویه‌تی : (هه‌ر كه‌سێك پێی خۆشه كه قورئان ببیستێت پیت به پیت به‌ڕوونی هه‌ر وه‌كو چۆن دابه‌زیوه، ئه‌وا با بچێ له ابن مسعود ه‌وه بیبیستێت) .



**١٤٩** - وە پیتەکان و دەنگەکان دەبیسترێن هەر وەکو ئەوەی کە بوونیان هەیە، نەك مەرجی بیستنیان بوونی ئەوان بێت بە چەند بەشێکی لکاوەوە بە گوێی بیسەرەوە.

بە پێچەوان النظام ـەوە.

**١٥٠** - وە کلامی الله تعالی پیتێکە کە لێی تێدەگەیت و مفهومە، وە دەنگێکی بیستراوە، لە جنس و ڕەگەزی دەنگ و پیتەکانی ئێمە نییە، هەروەکو باقی سیفاتەکانی دیکەی - واتە دەنگ و پیتەکانی لە هی ئێمەی مەخلوق ناچێت - .

احمد نەصی لەسەر ئەمە هەیە.

**١٥١** - پێچەوانەی ئەشعەریەکان کە دەڵێن:

قسەی نەکردووە بە پیت و بە دەنگ، وە کەلامەکەی واتایەکی جێگیرە بە زاتی خۆیەوە - واتە لای ئەوان کەلامەکەی کەلامی نەفسییە - .

وە ئەوەی ئادەم و موسا و پێغەمبەرمان علیهم الصلاة و السلام بیستویانە هەمان بیستن نییە، بەڵکو الله بیستنێکی بۆیان دروست کرد لە گوێیەکانیاندا.

**١٥٢** - وە بەڵگە لەسەر جێگیرکردنی دەنگ:

فەرمایشتی الله لە سورەتی (طه) : ﴿ إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ ١٢ ﴾ [طه]

وە لە سورەتی (النمل) : ﴿ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ٩ ﴾ [النمل]

وە لە سورەتی (القصص) : ﴿ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ٣٠ ﴾ [القصص]

ئەمەش دەقێكە .

**١٥٣** - وە لە عبدالله بن مسعود ـەوە رضي الله عنه وتی : كاتێك كە الله قسە دەكات بە وەحی ئەوا ئەهلی ئاسمان گوێیان لە دەنگەكەی دەبێت، ئینجا سوجدە دەبەن.

هەتاوەكو ئەو كاتەی ترسەكەیان لە دڵ نامێنێت .

یاخود وتی : دڵیان هێمن دەبێتەوە،

بەشێك لە ئەهلی ئاسمان بەشێكی دیكە لە ئەهلی ئاسمان بانگ دەكەن : پەروەردگارتان چی فەرموو؟

وتیان : حەق بەم شێوەیە و بەو شێوەیەی فەرموو .

البخاري لە صحیح ـەكەیدا ئەم ئەثەرەی دەرهێناوە .

**١٥٤** - وە هەروەها البخاري گێڕاویەتیەوە لە كتاب التوحید لە كۆتایی صحیح ـەكەیدا : لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە دەفەرمووێت : (الله بەندەكانی حەشر دەكات ئینجا

به دەنگێك بانگیان دەكات ئەوەی دووره گوێی لە دەنگەكە دەبێت به هەمان شێوەی ئەو كەسەی كە نزیكە، كە دەفەرمووێت : من المَلِك م، من الدَّيان م) .

وە ئەمەش دەقێكی دیكەیە .

---

: الملك و الدَّيان دوو ناوی الله تعالی ن، كە المَلِك واتە پاشا، وە الدَّيان واتە ئەو زاتەی كە حساب لەگەڵ بەندەكانی دەكات لە قیامەت هەروەها بەپێی كردەوەكانیان پاداشتیان دەداتەوە، وە هەروەها پاشایەكە كە باڵادەستە بەسەر بەندەكانی و گوێڕایەڵی دەكرێت، والله اعلم .

وە ئەمما بۆ پیتەكان :

**١٥٥** - ابن مسعود رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە دەفەرمووێت : (قورئان بخوێننەوە چونكە ئێوە بۆ هەر پیتێك پاداشت وەردەگرن بە دە چاكە، جا من ناڵێم ﴿الٓمٓ﴾ بە یەك پیت، بەڵكو بۆ ألف دە دانە، وە بۆ لام دە دانە، وە بۆ میم دە دانە، جا ئەمە دەكاتە سی) .



**١٥٦** - الله تعالى دەفەرمووێت : ﴿ بَلْ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ﴿٤٩﴾ ﴾ [العنكبوت] .

وە مەبەست لەمە یادی ئایەتەکەیە، چونکە ئەمە حاڵەتێکە لە سینەیاندا، هەر وەکو الله دەربارەی پێغەمبەرەکەی علیه الصلاة و السلام فەرموویەتی : ﴿ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ ﴿١٥٧﴾ ﴾ [الأعراف] .

وە مەبەستی پێی یادەکەی بوو .

---

: کاتێك الله دەفەرمووێت ئەمە ئایەتانێکە لە سینەی ئەوانەی عیلمیان پێ بەخشراوە، مەبەستی ئەوەیە ئایەتەکان لە سینەیاندا یادی هەیە، هەر وەکو چۆن فەرموویەتی گاور و جولەکەکان لە تەورات و ئینجیلدا پێغەمبەر ﷺ دەبیننەوە، کە بێگومان مەبەستی ئەوەیە تێیدا یاد کراوە .




**١٥٧** - ابن قتيبة وتی :

**١٥٨** - موعتەزیلە وتیان : ئەمانەتان گێڕاوەتەوە :

**١٥٩** - (دڵی قورئان : بریتییە لە یس - واتە سورەتی یس - ) .

---

: الترمذی بە ژمارە (٢٨٨٧) ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت کردووە و بە ضعیفیشی داناوە، وە امام احمد دەڵێت ئەمە وتەیەکی هەڵبەستراوە و موضوعە، و ابو حاتم دەڵێت فەرموودەیەکی باتڵە و ئەسڵی نییە .

**١٦٠** - وە (کۆپارەی قورئان : البقرة یە) .

---

: الترمذی بە ژمارە (٢٨٧٨) ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت کردووە و بە ضعیفیشی داناوە.

**١٦١** - وە (البقرة و آل عمران ڕۆژی قیامەت دێن وەکو بڵێی دوو هەورن، وە قوڕئان دێت بۆ لای پیاو لە گۆڕەکەیدا و بە پیاوەکە دەڵێت : ئاوا و ئاوا بوویت) - واتە دێت بۆ لای کەسی قورئان خوێن، واللە اعلم - .

وە دەڵێن ئەم فەرموودانە هەمووی دەلالەت لەوە دەکات کە قورئان مخلوقە، وە ناگونجێت کە شتێك دڵ، و کۆپاری هەبێ، وە هەورێك بێت و مخلوق نەبێت .

ابن قتیبة وتی : ئێمە دەڵێین : دەبوو ئەوان کە ئەگەر ماوەڵانی کەلام و قیاسن بیانزانیبا کە قورئان ناکرێ جەستە بێت، وە ناکرێت سنوور و چێوەی هەبێت .

وە مەبەست لەم فەرمایشتەی : (کۆپاری قورئان) : واتە بەرزترینی، هەروەکو چۆن کۆپاری حوشتر بەرزترین شوێنییەتی .

وە مەبەست لەم فەرمایشتەی : (دڵی قورئان) : یس ە : ئەوەیە کە یس لە قورئاندا لە جێگەی دڵە بۆ جەستە - واتە لە ڕووی گەورەیی و گرنگییەوە وەکو دڵ وایە بۆ جەستە - .

وە مەبەست لەم فەرمایشتەی : (البقرة و آل عمران دێن) :

واتە : پاداشتەکەیان لە ڕۆژی قیامەت دێتە لای ئەو کەسەی کە خوێندوویەتی هەتاوەکو ببێتە سێبەرێك بۆی، وە پیاو لە گۆڕەکەشیدا پاداشتەکەی بۆ دەهێنرێت .

وە دەکرێت اللە نموونەکان بەکاربهێنێت بەوشێوەی کە دەیەوێ بیکاتە حوججە و کۆتایی پێ بێنێت .

وە ئەگەر ئەوان چەند ڕێگەیەکیان پێ بدرێ کە بگونجێ و موافەقە بکات، ئەوا ئەوکاتیش دەیانزانی کە ناکرێ قورئان مخلوق بێ، چونکە کەلامی الله یە، وە کەلامی الله لە الله وەیە، وە هیچ شتێك لە الله وە دروستکراو نییە .

وە بەمە وا دادەنرێت کە گێڕانەوەی ئەو کاروبارانە بۆ ئەوە بێت کە لە کەلامی ئێمە تێ دەگەن، چونکە کەلامی ئێمە کردەوەی ئێمە نییە، بەڵکو دەنگێك و چەند پیتێکی لێك بچڕاوە، وە هیچیان ناکرێت کردەوەی ئێمە بن، چونکە هەموو دروستکراوەکانی الله دەکەونە ژێر ئەم پێناسەیەوە و ئەمەیان بۆ بەکاردەهێنرێت - لێرە کە دەڵێت : کەلامی ئێمە لە کردەوەی ئێمە نییە؛ هەڵەیە، ئێمە کردەوەمان هەیە، وە پاداشتیش لە الله وەیە - .

وە نمونەی ئەمە : نمونەی پیاوێکە کە بڕە پارەیەکت لای داناوە، پاشان داوای گێڕانەوەی پارەکەتت لێی کردووە، جا ئەو بە دەستی خۆی پێت دەداتەوە، خۆ ئەو هیچ بەشێکی لەو پارەیە بۆ نییە، وە بۆ دەستیشی پاداشت نییە، بەڵکو پاداشتەکە هی پێدانەوەی پارەکەیە .

وە بە هەمان شێوە پاداشتی تۆش ئاوایە کاتێك قورئان ئەدا دەکەی بە دەنگێك و چەند پیتێکی لێك بچڕاو .

جا قورئان بەم نیزام و نوسینە کەلامی الله یە، و لەوەوە دەستی پێکردووە .

وە هەر کەسێك کە ئەدای دەکات ئەوا کەسێکە کە کەلامی الله ی ئەدا کردووە، ئەمەی لێ دانامالدرێ کە ئەو خوێنەری کەلامی الله بێت .

خۆ ئەگەر کەسێك وتارێك بنوسێتەوە، یان سروودێك بنوسێتەوە، پاشان ئەمانەی لێوە نەقڵ بکرێت، ئەوا نە وتەکانی و نە سروودەکەشی کردەوەی ئەو کەسە

نییه كه نه‌قڵی كردووه، به‌ڵكو كرده‌وه‌كه هی نوسه‌ره‌كه‌یه، وه هیچ شتێك بۆ ئه‌و كه‌سه نییه كه نه‌قڵی كردووه جگه له ئه‌دا كردنی .




**١٦٢** - ابن قتيبة وتی :

**١٦٣** - وە موعتەزیلە وتیان :

**١٦٤** - دەربارەی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ كە دەفەرمووێت : (ئەگەر قورئان بخرێتە ناو پێستێكی خۆش نەكراو - واتە إهاب - ، پاشان بخرێتە ناو ئاگرەوە ئەوا ناسوتێت) .

وتیان : بە ڕاستی ئێمە موصحەفمان دیوە كە دەسوتێت، وە عثمان بن عفان رضي الله عنه سوتاندوویەتی - باسی ئەو كاتە دەكەن كە امام عثمان قورئانی كۆكردەوە - .

وە لێكدانەوەی ئەمەش لە چەند ڕوویەكەوەیە :

یەكەمیان : ئەوەی كە الأصمعي دەربارەی إهاب وتویەتی : لاشەی ئیمانداره كه بەهۆی تاوانەوە دەخرێتە ناو ئاگرەوە جا ئاگرەكە نایسوتێنێ، هەر وەكو

**١٦٥** - أبو أمامه رضي الله عنه فەرموویەتی : قورئان بخوێنن، وە با ئەم موصحەفانە لە خۆباییتان نەكەن، چونكە الله دڵێك سزا نادات كە قورئانی تێدا بێت.

: ابو عبيد القاسم بن سلام له (فضائل القرآن . ١/٢٤٤) دەڵێت : ڕووی ئەمە لای ئێمە بريتيە لەوەی : كە دەكرێ مەبەست لە (إهاب) : دڵی ئیماندار بێ وە ناخی بێ كە قورئانی تێدایە و لەبەری كردووە.

وە دووەمیان : مەبەستی ئەوەیە كە : ئەگەر قورئان بنوسرێتەوە لەسەر پێستەیەك و بخرێتە ئاگرەوە، ئەوا پێستەكە و حیبرەكە دەسوتێن، وە قورئانەكە ناسوتێت، وەك بڵێی الله عز و جل لەوێ بەرزی دەكاتەوە و دەیپارێزێت لە ئاگرەكە .

وە سێیەمیان : دەكرێت ئەمە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بووبێت وەكو بەڵگەیەك بۆ موشریكەكان كە پێستەكە ناسوتێت .

وە هەروەها ئەوەی كە كراوە لە كاتی ژیانی خۆیدا، هەر وەكو ئەوەیە كە بەڵگەكان هاتووە لە ژیانی پێغەمبەراندا : وەكو زیندووبوونەوەی مردوویەك، وە قسەكردنی گورگێك، وە شكات كردنی حوشترێك، وە فڕێدانی لە گۆڕ نراوێك لە لایەن زەوییەوە، پاشان لەدوای خۆیان ئەم شتانە دەوەستێنرێن - واتە دوای پێغەمبەران ئەم موعجیزانە دەوەستێنرێن، جا دەكرێ نەسوتانی ئەو پێستەیەی كە قورئانی تیا نوسراوە موعجیزەیەك بووبێت و دواتر وەستێنرابێت - .

وە ئێمە ئینكاری ناكەین كە ئەوەی لە ناو موصحەفەكاندایە قورئان بێت بە حەقیقی نەك بە مەجاز، هەر وەكو چۆن هاوەڵانی كەلام دەڵێن : ئەوەی لە موصحەفەكاندایە دەلالەتە لە قورئان، و خودی قورئان نییە - ئەمە ئەشعەریەكانن كە پێیان وایە ئەوەی لەقورئاندایە مەجازە و عیبارەتە لە قورئان نەك خودی قورئانەكە - .

بەڵام الله عز و جل دەفەرموویت : ﴿ إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ٧٧ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ٧٨ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ٧٩ ﴾ [الواقعة] .

**١٦٦** - وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت : (قورئان مەبەن لەگەڵ خۆتاندا کە سەفەر دەکەن بۆ خاکی دوژمن) .

مەبەستی : موصحەفە .

وە نەك ئەوەی کە دەڵێت : مەبەستی هەڵگری قورئانە - واتە حافظ قورئان - بە شتێکەوە، چونکە قەدەغە بوو کە هەڵگرانی قورئان جیهاد بکەن لە پێناو الله، وە ئەم قسەیە دروست نییە .

# باب : ١٣

## ئیمان هێنان بەوەی کە ئیمانداران الله تعالی دەبینن لە ڕۆژی قیامەت



١٦٧ - لە جرير بن عبدالله وە رضي الله عنه وتی : لای رسول الله ﷺ بووین و مانگی نیشانداین لە شەوی بەدردا، وە فەرمووی : (ئێوە پەروەردگارتان دەبینن هەروەکو چۆن ئەمە دەبینن - واتە مانگی پڕ - و هیچ نارەحەتیەکتان نایەتە پێش لە بینینیدا) .

١٦٨ - لە صهيب ـەوە رضي الله عنه : کە رسول الله ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ ٢٦﴾ [يونس] .

فەرمووی : (وە کاتێ ئەهلی بەهەشت خرانە بەهەشتەوە، وە ئەهلی ئاگریش خرانە ئاگرەوە، ئەوا بانگەکەرێك بانگ دەکات : ئەی ئەهلی بەهەشت، ئێوە لەلایەن الله وە بەڵێنێکتان پێدراوە - ئێستاش کاتی بەجێهێنانی بەڵێنەکە هاتووە - ، دەیەوێت پاداشتتان بداتەوە) .

فەرمووی : (دەوترێت : جا ئەو پاداشتە چییە؟ مەگەر ڕووخسارمانی سپی نەکرد، وە تای تەرازوومانی قورس نەکرد، وە ئێمەی نەخستە بەهەشتەوە، وە ئێمەی نەپاراست لە ئاگر؟

ئینجا پەردە لادەبرێت و ئەوانیش تەماشای الله دەکەن) .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە الله هیچ شتێکی پێنەبەخشیون خۆشەویستتر بێت بۆیان و ڕوناکتر بێت بۆ چاویان لە سەیرکردنی الله).

١٦٩ - وە الشافعي رحمه الله وتی : بیستم الله دەفەرموویێت : ﴿كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ١٥﴾ [المطففين] .

جا ئەگەر - کافرانی - لە دیتنی خۆی بێبەش کرد و پەردەی دا بەسەر چاویاندا لە توڕەییدا، ئەوا ئەمە دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە - ئیمانداران - دەیبینن وەکو ڕەزامەندییەك بۆیان .

منیش وتم - واته الربيع بن سليمان - : ئایا تۆ ئەم قسەیە دەکەیت؟

وتی : بەڵێ، وە بەم قسەیە دینداری بۆ الله عز و جل دەکەم .

١٧٠ - وە أحمد بن حنبل رحمه الله لە ڕیوایەتی حنبل دا وتی : هەر کەس پێی وابێت کە الله نابینرێت لە ئاخیرەت دا، ئەوا کوفری بە الله کردووە، وە قورئانی بە درۆ خستۆتەوە، وە ڕەددی فەرمانی الله ی داوەتەوە، داوای تەوبە کردنی لێ دەکرێت، جا ئەگەر تەوبەی کرد باشە، ئەگەرنا دەکوژرێت .

١٧١ - وه پیاوێك به مالك بن أنس ى وت : ئایا ئیمانداران پەروەردگاریان دەبینن لە ڕۆژی قیامەت؟

وتی : خۆ ئەگەر نەیبینن ئەوا الله كافرانی عەیبدار نەدەكرد بە پەردە دان بەسەر چاویاندا، الله دەفەرمووێت : ﴿كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ١٥﴾ [المطففين] .

---

: واتە ئەگەر ئیمانداران الله نەبینن، ئەوا الله نەیدەفەرموو كە كافران چاویان پەردەی لەسەرە و ناتوانن الله ببینن، وە بینینەكەش بە چاوی سەر دەبێت .




**١٧٢** - ابن قتيبه وتی :

**١٧٣** - موعتەزیله وتیان جا چۆن ئەوەی كه ئێوه گێڕاوتانەتەوه صحیحه - مەبەستیان فەرموودەی بینینی الله یه - ، له كاتێكدا الله تعالى دەفەرمووێت :

﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ﴿١٠٣﴾ ﴾ [الأنعام]

وه دەفەرمووێت : ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ﴿١١﴾ ﴾ [الشورى]

وتیان : خۆ ئەگەر فەرموودەكەش صحیح بێت ئەوا ئێمه واتای بینین به زانست مانا دەكەین - واته پێیان وایه رؤية بەمانای زانست دێ نەك بینینی الله تعالى - ، هەروەكو الله تعالى دەفەرموێت : ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ ﴿١﴾ ﴾ [الفيل]

مەبەستی - له بینین لەم ئایەته - بریتیه له : ئایا نەتزانیوه؟

وه وەڵامی ئێمه - واته ابن قتيبة - : ئەوەیه كه ئەم فەرموودەیه صحیحه، كەسانی متمانەپێكراو نەقڵیان كردووه كه ئەو كەسانه حەڵاڵ و حەرامیشیان نەقڵ كردووه .

وە ئەوەی کە ئەوان وتیان هەڵوەشێنەرەوە و پێچەوانەی ئەم فەرموودەیە نییە، چونکە فەرمایشتی الله : ﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾ [الأنعام]

وە فەرمایشتەکەی بۆ موسى عليه السلام : ﴿ لَن تَرَىٰنِي ﴿١٤٣﴾ ﴾ [الأعراف] .

مەبەستی لە ژیانی دونیایە، لەبەر ئەوەی پەردەی داوە بەسەر دروستکراوەکانیدا لە دونیادا، بەڵام لە ئاخیرەتدا بە شکۆوە بۆیان دەردەکەوێت .

وە تەشبیهیش نەکراوە بە مانگ لە هەموو ڕووەکانییەوە : لە سوڕانەوە، وە لە مەسارەکەی، وە سنورەکەی، وە غەیری ئەمانەش؛ بەڵکو واتاکە مانگە .

---

: مەبەستی ئەوەیە لەم فەرموودەیە الله نەشوبهێنراوە بە مانگ کە گوایە الله وەکو مانگ خولگە و مەسار و سنوری هەبێت، بەڵکو بینینی دروستکراوەکان شوبهێنراوە، واتە چۆن مانگ دەبینن بەو شێوەیەش الله دەبینن .

وە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ : (ناڕەحەت نابن، یان هیچ ئاستیەنگیەک تووشتان نابێت)، واتە : ئەوەی ناوێت کە بۆ بینینی مانگی میلال لە سەرەتای مانگەکاندا پێویستییەتی، بەڵکو هەموو کەسێك لە ئێوە لە جێی خۆیەوە دەیبینێت .

---

: والله اعلم، بۆ نمونە چۆن ڕەمەزانان پێویستە کەسانێك بچنە سەر شاخ بزانن مانگ دەر دەکەوێ یان نا، کە ئەمە ناڕەحتییەکە و ئەوانەی خوار شاخیش نایبینن، جا دەفەرمووێت بەو شێوەیە نییە لە

قیامەت بەڵکو هەر کەسەو لە جێی خۆیەوە الله دەبینێت، بۆ شەوی مانگی چواردە کە مانگ جوان و پڕە هەموو خەڵکی دەتوانن تەماشای ئاسمان بکەن تا مانگەکە ببینن، جا هیچ شتێک نابێت بە ئاستەنگ و ناڕەحەتی لە بینینی مانگی چواردەکە لە شەوێکی بێ هەوردا .

وە داواکردنەکەی موسى علیه السلام بۆ بینینی الله تعالى، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەکرێ ببینرێت، ئەگەر نا ئەو داوایەی نەدەکرد .

وە ئەوەش کە مانای بینینیان بە زانست لێکدایەوە؛ مەحاڵە، چونکە خۆ ئێمە لە دونیاشدا زانیاریمان پێی نییە ئەگەر وابێت ئەو کات چ ئیسفادەیەك لەم هەواڵە هەیە لە کاتێکدا خەڵکی لە دونیا و قیامەتیشدا هەمان شت بن؟!

وە مانای ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾ [الأنعام] واتە : سنوردار و کۆتایی هاتوو، لەبەرئەوەی کە کەسێك بینینی درك بە شتێك بکات ئەوا ئیللا بەم شێوەیە دەبێت .

وە ئەمەش بەو شێوەیەیە کە فەرموویەتی : ﴿ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ﴾ [طه]، وە ئەگەر چی زانراو بێت .

وە هەروەك چۆن ئاسمان دەبینین ئەگەر چی درکیشی پێ نەکەین .

---

: والله اعلم، واتە کە الله دەفەرمووێت چاوەکان درکی پێ ناکەن واتە نازانن چیە چونکە ئەگەر درکی پێ بکەن دەزانن شێوەی چۆنە، وە وردەکاری شتە دەزانن، هەروەکو کەسێك کە ئاسمان دەبینێت بەڵام درکی بە هەموو ئاسمان نەکردووە، یاخود کەسێك دەریا دەبینێ بەڵام خۆ درکی بە هەموو دەریا نەکردووە.

الآجري له (الشريعة - ١٠٤٦/٢) دەڵێ : ئەگەر هەندێك لەو کەسانەی کە شەیتان بەسەریاندا زاڵ بووە و لە دوودڵی خۆیاندا سەرلێشێواو بوونە ئینکاریان کرد و پێیان وابوو کە الله عز و جل نابینرێ لە قیامەتدا، وە بەڵگەیان هێنایەوە بە فەرمایشتی الله : ﴿لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَرَ﴾ جا نکۆڵیان لە دیتنی الله کرد بە هۆی لێکدانەوەی هەڵەی خۆی بۆ ئەم ئایەتە .

پێی دەوترێت : ئەی نەزان ئەو کەسەی کە الله عز و جل قورئانی دابەزاندووەتە سەری، و کردوویەتی بە حوججە لەسەر دروستکراوەکانی، و فەرمانی پێ کردووە بە ڕونکردنەوەی ئەو شتەی کە دایبەزاندووەتە سەری بە وەحی - واتە فەرمانی کردووە بە پێغەمبەر ﷺ بە ڕونکردنەوەی قورئان - ، ئەو شارەزاترە بە لێکدانەوەی ئەم ئایەتە لە تۆ هەی جەهمی، هەر ئەوە ﷺ کە بە ئێمەی فەرمووە : (ئێوە پەروەردگارتان دەبینن هەروەکو چۆن ئەم مانگە دەبینن) .

جا ئەگەر قسەکەرێك وتی : ئەی لێکدانەوەی ئەم فەرمایشتەی الله چییە کە دەفەرموێت : ﴿لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَرَ﴾

لە وەڵامدا پێی دەوترێت : واتاکەی لای ئەهلی علم ئەوەیە : کە چاوەکان زانیاریان پێی نییە، و بە بێ ئەوەی درکی پێ بکەن دەیبینن، وە گومانیان بۆ دروست نابێ لە بینینی هەروەکو پیاو کە دەڵێ : ئاسمانم بینی و ڕاستیش دەکات، بەڵام چاوی زانیاری نیە بە هەموو ئاسمان و درکی پێ نەکردووە، وە هەروەکو پیاو دەڵێ : دەریام بینی و ڕاستیش دەکا، بەڵام چاوی زانیاری نیە بە هەموو دەریا و درکی پێ نەکردووە، زانایان بەم شێوەیە تەفسیریان کردووە ئەگەر تۆ عەقڵت کار بکات .



## بەشێك

**١٧٤** - ابن قتيبة وتی :

جا ئەگەر وتیان : ئەو بینینە و بینراوەکەش چۆنن؟

دەڵێین : ئێمە کۆتایی ناهێنین لە باسکردنی سیفاتەکانی الله عز و جل مەگەر هەتا ئەو شوێنەی کە رسول الله ﷺ کۆتایی پێ هێناوە - واتە کاتێك دەوەستین کە پێغەمبەر ﷺ لێی وەستابێت لە باسکردنیان - ، وە هیچ شتێك ڕەد ناکەینەوە کە لەوەوە بە صحیحی هاتبێت، لەبەر ئەوەی خەیاڵمان بۆی ناچێت، وە نایەتە سەر بینینیشمان، بەڵام ئیمانمان پێی هەیە بەبێ ئەوەی قسە بکەین دەربارەی چۆنیەتەکەی، یاخود بە حەددێك، یان ئەوەی کە هاتووە قیاسی بکەین بە شتانێك کە نەهاتووە .

وە ئومێدمان وایە کە لەم وتە و هزرەدا ڕێگەیەك هەبێت بۆ ڕزگار بوون لە سبەینێدا ان شاء الله .

---

: حەدد واتە سنوور، دوو واتا هەڵدەگرێت :

١ - جێگیرکردنی سیفەتی العلو ی الله، مەبەست ئەوەیە کە جیایە لە دروستکراوەکانی، واتە سنوورێک هەیە لە نێوان الله تعالى و تەواوی دروستکراوەکانی، الله عز وجل لە سەر عەرش ە و لە هەموو مەخلوقەکانی جیایە، جا حەدد بەم واتایە دەبێت جێگیر بکرێت .

٢ - بەڵام ئەوەی لێرە نەفی کراوە، مەبەست ئەوەیە ئێمە سنوور بۆ سیفاتەکانی الله دانانێین، واتا ئێمە دەزانین کە الله عز وجل سیفەتی علیم ی هەیە، بەڵام ناتوانین حەدد و سنوور دابنێین بۆ عیلمەکەی و بڵێین الله تعالی ئەوەندە دەزانێت، وە دەزانین کە الله عز وجل سیفەتی هێز (قوة) ی هەیە، بەڵام ناتوانین حەدد و سنوور دابنێین بۆ هێزەکەی و بڵێین الله تعالی ئەوەندە دەتوانێت، وە دەزانین کە الله عز وجل سیفەتی بینین ی هەیە، بەڵام ناتوانین حەدد و سنوور دابنێین بۆ بینینەکەی و بڵێین الله تعالی ئەوەندە دەبینێت، چونکە سیفەتەکانی الله عز وجل کاملی موتڵەق ن، ئەوجا کە لێرە ابن قتیبة وتویەتی بەبێ حەدد، ئەم واتایەیان دەگرێتەوە .

لە بابەتی حەدد دەبێت ڕەچاوی مەبەستی کەسەکە بکرێت، ئەگەر جەهمی و ئەشعەری بوو ئەوە کوفر لەژێر وشەی حەدد دا دەشارنەوە، وە ئەگەر کەسەکە ئەهلی سوننە و جەماعە بوو ئەوە یەکێک لەو دوو واتایەی سەرەوەی مەبەستە وەک چۆن هەر دوو قەولەکە لە ئیمام احمد رحمه الله وە هاتووە، والله اعلم .

**١٧٥** - لێرەوە قسەی ابن البناء ە - : **وە ئەم وتەیە لەوەوە ڕەحمەتی الله ی لێبێت مەزهەبی ئێمەشە** - واتە قسەکەی ابن قتیبة مەزهەبییەتی - .

**وە ئەمە وتەی پێشەوایانی موسڵمانانە دەربارەی هەموو ئەو هەواڵانەی سیفات کە گێڕدراوەتەوە .**

**١٧٦** - **أحمد وتی : هەر کەس وتی : الله دەستی هەیە وەکو دەستی من؛ ئەوا الله ی چواندووە بە دروستکراوەکانی .**

---

: الله عز وجل دەستی هەیە بەڵام مەبەستی امام احمد ئەوەیە نابێت بچوێنرێت بە دەستی هیچ کەس و شتێک لە دروستکراوەکانی .

١٧٧ - أبو عبيد القاسم بن سلام ئەو بابەی باسکرد کە (بینین) تێیدا گێڕدراوەتەوە،

وە (کورسی جێی دوو پێیەکانێتی)،

وە (پەروەردگارمان پێکەنی بە نائومێدی بەندەکانی)،

وە (ئایا پەروەردگارمان لە کوێ بووە پێش ئەوەی ئاسمان دروست بکا؟)،

وە (جەهەننەم پڕ نابێت هەتا پەروەردگارت پێی خۆی تێدا دادەنێ و جەهەننەم دەڵێت : قط قط)،

وە هاوشێوەی ئەمانە لە فەرموودەکان .

پاشان وتی : ئەمانەی فەرموودەی صحیحن، هاوەڵانی فەرموودە و فەقیهەکان هەندێکیان لە هەندێکیان وەرگرتووە، وە ئەمانە لای ئێمەش حەقن و هیچ گومانێکیشیان تێدا نییە، بەڵام ئەگەر وترا چۆن پێی دانا؟ وە چۆن پێکەنی؟

ئەوا دەڵێین : ئێمە ئەمە تەفسیریان ناکەین و لێکیان نادەینەوە، وە نەمان بیستووە کەسێك تەفسیری کردبێتن .

---

: ئاشکرایە کە مەبەستی تەفسیر کردنی چۆنیەتیەکەیەتی نەك مەعناکەی، چونکە واتاکانی زانراوە بەڵام چۆنیەتیەکەی نەزانراوە، وە مانای فەرموودەکان زۆر ڕوونە بۆ کەسێک الله عز وجل سنگی فراوان کردبێت بۆ وەرگرتنی ئیسلام .

**١٧٨** - وه موعتەزیلە ڕەددی دەکەنەوە .

**١٧٩** - وه ئەشعەرییەکان تەئویلی دەکەن - واتە لێکدانەوەی باتڵ کە واتا ڕاستەقینەکەی خۆی پێ ڕەدد دەکەنەوە وەکو جهم بن صفوان و بشر المريسي لعنهم الله جميعا لعنة واسعة - .

بەڵام هاوەڵانی فەرموودە : بەڕێیان دەکەن هەروەك ئەوەی کە هاتووە بەبێ بەتاڵ کردنەوە، و تەئویل کردن .

---

: کوفری جەهمی و ئەشعەریەکان لە بابەتی پەکخستنی سیفاتەکانی الله عز وجل دا هەمان شتە، بگرە ئەشعەریەکان غولاتی جەهمین، دەتوانن ئەم نامیلکەیە بخوێننەوە بۆ زیاتر ئاشنابوون بە شێوازی پەکخستنی سیفەتەکانی الله تعالى لە هەردوو لاوە لعنهم الله .

https://t.me/Ktebxanay_salaf1/66

https://workupload.com/file/Cj2PGPdt3DY

**١٨٠** - وکیع وتی : ئەم فەرموودانە وەردەگرین هەر وەکو ئەوەی کە هاتوون، وە نالێین ئەمە چۆنە؟



## بەشێك

**١٨١** - وە پێغەمبەرمان ﷺ پەروەردگاری خۆی عزَّوَجَل بینیوە بە هەردوو چاوی لە شەوی ئیسڕادا لە صحیحترین ڕیوایەت لە أحمد ەوە .

---

ڕوونکردنەوە لەسەر ئەثەری ١٨١ :

ئەمە ابن البناء لە شێخەکەی خۆی قاضي ابي يعلى وەری گرتووە کە ابن تیمیة ڕەددی ئەوە ئەکاتەوە کە امام احمد وتبێتی بە چاوەکانی دیویەتی - واتە امام احمد نەیوتووە بە چاو بینیویەتی - ، هەر وەکو لە (مجموع الفتاوى - ٥٠٩/٦) دەڵێت : امام احمد جارێك بە ڕەمایی دەیوت بینیویەتی، وە جارێکیش دەیوت بە دڵی دیویەتی، وە هیچ کەس نەیوتوە : کە گوێی لە احمد بووبێ وتبێتی : بە چاوی بینیویەتی؛ بەڵام کۆمەڵێك لە ماوەڵانی کە گوێیان لە قسە ڕەماکانی بووە وا تێگەیشتوون مەبەستی بینین بە چاو بووبێت، هەر وەکو چۆن هەندێك کەس قسە ڕەماکانی ابن عباسیان رضي الله عنهما گوێ لێبوو و وایان زانی مەبەستی بینینە بە چاو .

**١٨٢** - جابر رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە، لە پێغەمبەر ەوە ﷺ دەربارەی فەرمایشتی الله : ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ ﴾ [النجم]، فەرمووی : (پەروەردگاری خۆم عزَّوَجَل بینی ڕوو بە ڕوو هیچ گومانیشی تێدا نییە) .

---

ڕوونکردنەوە لەسەر ئەثەری ١٨٢ :

ابن تيمية لە (بيان تلبيس الجهمية - ٢٦٩/٢) دەڵێت : ئەم فەرموودەیە درۆیە و هەڵبەستراوە بۆ رسول الله ﷺ بەبێ ئەوەی کە ئەهلی عیلم هیچ ناکۆکیەکیان لەسەر ئەوە هەبێ کە هەڵبەستراوە، وە ڕاستیش نیە ئەم لەفزە هی رسول الله ﷺ بێت، چونکە وشەی ڕووبەڕوو بوونەوە (المشافهة) بۆ گفتو گۆ بەکاردێت نەك بۆ بینین .

هەروەها لە صحيح مسلم (٣٥٤) هاتووە کە ئەم ئایەتە مەبەست پێی بینینی جبريله عليه السلام لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی، وە هەر لە صحيح مسلم (٣٥٦) هاتووە کە ابن عباس دەربارەی ئەم ئایەتە دەفەرمووێت : دوو جار بە دڵی بینیویەتی .

**١٨٣** - وە لە ابن عباس ـەوە رضي الله عنهما دەربارەی : ﴿وَمَا جَعَلْنَا ٱلرُّءْيَا ٱلَّتِىٓ أَرَيْنَٰكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ ۝٦٠﴾ [الإسراء]، دەفەرمووێت : ئەمە بینینە بە چاو کە نیشانی پێغەمبەر ﷺ درا ئەو شەوەی کە شەوڕەوی پێکرا .

البخاري و مسلم ئەم ئەثەرەیان تەخریج کردووە .

---

: ڕوونکردنەوە لەسەر ئەثەری ١٨٣:

ابن تيمية لە (بيان تلبيس الجهمية - ٢٦٠/٧) دەڵێت : ئەم هەواڵە هیچ شتێکی لەوە تێدا نییە کە بە چاوی بینیبێتی جگە لەوەی کە الله نیشانی داوە، وە قورئان بە ڕاشکاوی ئاماژەی بەوە کردووە کە بەڵگە و نیشانەکانی پیشان داوە - واتە ئەم ئایەتی ٦٠ ی الإسراء باس لەوە ناکا الله ی بینیبێ بە چاو بەڵکو بەڵگە و نیشانەکانی الله ی دیوە بە چاو - ، هەروەکو دەفەرمووێت : ﴿**سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِّنَ الْمَسْجِدِ**

الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا ۚ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ [الإسراء : ١]، وه له سوڕەتی النجم فەرموويەتی : ﴿لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَىٰ﴾ [النجم : ١٨] .

كه ئەمە دەلالەت لەوە دەكات كە : كە الله ڕايگەياندووە كە ئەم نيشاندانەی نەكردووە بە هيچ شتێك جگە لە تاقيكردنەوەيەك بۆ خەڵكی، چونكە كە پێغەمبەر ﷺ كاتێك ئەوەی پێ ڕاگەياندن بوو بە تاقيكردنەوەيەك بۆيان، وە تێياندا كەسانێك هەبوو بە درۆی خستەوە، وە پێغەمبەريش ﷺ پێی نەوتون كە پەروەردگاری بە چاوی بينيوە لەو شەوەدا .

**١٨٤ - وە هەر لە ابن عباس ەوە رضي الله عنهما : محمد ﷺ دوو جار پەروەردگاری بينيوە :**

**يەكێكيان : بە چاوی، وە ئەوەی تريان : بە دڵی .**

**پاشان ئەم ئايەتانەی خوێندەوە : ﴿مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ۝١٧﴾ [النجم]، وە ﴿مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ۝١١﴾ [النجم] .**

---

: ڕوونكردنەوە لەسەر ئەثەری ١٨٤ :

ابن تيمية لە (بيان تلبيس الجهمية - ٢٥١/٧) ئەم ئەثەرەی بە ضعيف داناوە و ڕوونی كردوەتەوە كە حفظ نەكراوە لە مجالد ەوە، وە پێچەوانەی ئەو كراوە، هەروەها لە اسنادەكەيدا جمهور بن منصور الكوفي تێدايە كە مجهول ە .

**١٨٥** - وە لە لەفزێكی دیكەدا - هەر لە ابن عباس ەوە - : دۆستایەتی و خۆشەویستی بۆ ابراهیم بوو، وە كەلام بۆ موسی، وە بینینیش بۆ محمد ﷺ .

---

: ابن تیمیة لە (بیان تلبیس الجهمیة - ٢٨٤/٧) ئەمە بە صحیح دادەنێ لە ابن عباس ەوە، بەڵام هەر وەكو پێشتر ڕوونكردنەوەمان دا كە بە ڕەهایی وتویەتی بینیویەتی نەك بە چاو .

**١٨٦** - المروذي وتی : بە باوكی عبدالله م وت - واتە امام احمد - : بە چ شتێك وتەی عائشة رضي الله عنها ڕەت دەكەیتەوە كە دەفەرمووێت : (هەر كەس پێی وابێت كە محمد ﷺ پەروەردگاری بینیوە، ئەوا گەورەترین بوهتانی لەسەر الله هەڵبەستووە)؟

وتی : بە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ، كە فەرمایشتەكەی گەورەترە لە هی ئەو .

وە ئەم بابەتە - واتە ئەم جیاوازیە - لە سەردەمی هاوەڵاندا ڕوویدا رضي الله عنهم .

---

: ڕوونكردنەوە لەسەر ئەثەری ١٨٦ :

ئەمە واتاكەی ئەوە نیە كە امام احمد لەگەڵ وتەی هاوەڵان پێچەوانە بووە یاخود بڵێین مادام امام احمد وتەی عائشة ی رضي الله عنها ڕەتكردۆتەوە ئێمەش بۆمان هەیە وابكەین، نەخێر، چونكە ابن قیم لە (التبیان : ص ٣٩٥) دەڵێت : بەڵام لە ڕەتكردنەوەی امام احمد بۆ وتەكەی عائشة ئەوە دەردەخات كە احمد ئەو بینینەی جێگیر كردووە كە عائشة ئینكاری لێكردووە، وە عائشة ئینكاری لە بینینی الله ی نەكردووە لە خەوندا - واتە لە لایەن پێغەمبەر ﷺ - چونكە نەیفەرمووە : (هەر كەس پێی وابێت محمد ﷺ لە خەوندا پەروەردگاری دیوە ئەوا گەورەترین درۆی لەسەر الله هەڵبەستووە) .

جا ئەمە دەلالەت لە دوو شت دەكات :

١ - یان ئەوەتا امام احمد ئینكاری لە وتەی هەموو ئەوانە كردووە كە بە ڕەهایی ئینكاری بینینیان كردووە، چونكە پێچەوانەی فەرموودەیە .

٢ - وە یان ئەوەتا ڕیوایەت لێوەی هەیە بە جێگیر كردنی بینین، چونكە بە ڕاشكاوی وتویەتی كە بینیویەتی بە دڵ لە خەوندا، جا ئەمە مەرجەكەیەتی بۆ بینین، بە ڕەهایی وتویەتی دەیبینێت، وە ئینكاری لەوە كردووە كە بینینی ڕەهای نەفی كردووە، وە وتنی : (بینینی) بە باش زانیوە، ناڵێت : (بە چاوی، و بە دڵیش نا)، وە ئەم نوسراوانە لێیەوە اتفاق لەسەرە و خیلافی تێدا نیە، جا چۆن احمد دەڵێت : (بە چاوی سەر و بە ئاگایی دیویەتی)، و لە كاتێكدا ئەمە لە فەرموودەدا نەهاتووە مەرگیز؛ پاشان احمد تەنیا شوێنی دەربڕینی فەرموودە كەوتووە هەر وەكو ئەوەی كە هاتووە، وە ئینكاری كردنی لە وتەی : (ئەسڵەن نەیدیوە) دەلالەت لە جێگیر كردنی بینین بە چاو و بە ئاگاییەوە ناكا، واللە اعلم .

**١٨٧ - وە عائشة رضي الله عنها نكۆڵی لەوە دەكات كە ئەو شەوە بینیبێتی .**

**١٨٨ - كەچی ابن عباس، و أنس رضي الله عنهم، وە جگە لەوان جێگیری دەكەن.**

---

: امام احمد لە (بیان تلبیس الجهمیة - ٧/١٧٠) دەڵێت : هاوەڵان خیلافیان هەبوو لە بینینی اللە لە دونیادا، بەڵام هیچ كەس خیلافی لە بینین نەبووە لە قیامەت جگە لە جەهمییەكان .

هەروەها ابن تیمیة لە (جامع الرسائل - المجموعة الثانیة - ص ١٠٦) دەڵێت : لە زانایان بوونی هەیە كە وتەی عائشة و ابن عباس یان كۆكردبێتەوە، وە دەڵێت : عائشة ئینكاری لە بینین بە چاو كرد، وە ابن عباس باسی بینینی بە دڵ كردووە، وە لەمەدا هیچ نەفی كردنێك لە نێوانیان نییە. وە لە زانایاندا هەیە كە كردوویەتی بە دوو وتەی جیاواز، وە زۆربەی ئەهلی سوننە وتەكەی ابن عباس بە ڕاجح دەزانن، بۆ ئەو

جێگیرکردنەی کە تێیدایە، وە بۆ ئەوەش کە گێڕراوەتەوە لە پێغەمبەر ەوە ﷺ کە دەفەرمووێت : (پەروەردگارمم بینی) .

وە النسائي لە (التفسير - ص ٥٥٦) لە أبي ذر رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە کە دەفەرمووێت : بە دڵی بینیویەتی، وە بە چاو نەیدیوە. وە اسنادەکەشی صحیحە .

**١٨٩** - لە ابن عباس ەوە رضي الله عنهما، وتی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (پەروەردگارمم عزَّوَجَل بینی) .

**١٩٠** - ابو علي ابن البناء وتی : وە ئەو فەرموودانەم لە ابن عباس ەوە رضي الله عنه باس کردووە، وە ڕێگاکانی - گێڕانەوەی - لە بەشێکی تاکدا باس کردووە، وە ئەوەشم گێڕاوەتەوە لە پێشەوایانی موتەقەدیمین و موتەئەخیرین، وە پرسیارەکان لەسەری - کە کردوومە - ، و وەڵامەکان دەربارەی - کە وەرمگرتووە - .

## باب : ١٤

## ئیمان هێنان بە تەرازوو وە ئەوەش کە کردەوەی بەندەکانی پێ دەکێشرێت، وە دوو تای هەیە :

## دانەیەکیان بۆ چاکەکان : کە خاوەنەکەی دەکاتە بەهەشتەوە .

## وە دانەیەکیان بۆ خراپەکان : کە خاوەنەکەی دەخاتە ئاگرەوە .

## وە زمانێکی هەیە کە قسەی پێ دەکات سەبارەت بەوەی پێی دەکێشرێت .



**١٩١** - لە سلمان ـەوە رضي الله عنه، فەرمووی : تەرازوو دادەنرێت لە ڕۆژی قیامەتدا، خۆ ئەگەر ئاسمانەکان و زەوی بخرێتە سەر ئەوا ڕایدەگرتن، فەرمووی : ئینجا فریشتەکان دەڵێن : پەروەردگارا بەمە کێشانە بۆ کێ دەکەیت؟ فەرمووی : بۆ هەر کەسێك کە بمەوێت لە دروستکراوەکانم .

**١٩٢** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (لە ڕۆژی قیامەتدا پیاوێك دەهێنرێت، پاشان تەرازوو دەهێنرێت، پاشان نەوەد و نۆ تۆمار دەهێنرێت : هەر تۆمارێك هەتاوەکو چاو بڕ بکا، هەڵە و گوناهی ئەو کەسەی تێدایە، پاشان تۆمارەکان دەهێنرێت و دەخرێتە سەر تایەکی تەرازووەکە، پاشان لاپەڕەیەك دەردەهێنرێت بەم شێوەیە، وە بە پەنجە

گەورەی نیوەی ئەو پەنجەیەی گرت کە بۆ دوعا بەکاردێت، تێیدا - واتە لە لاپەڕەکەدا - شایەتی دان بە (لا الە الا اللّٰه، و محمدا رسول اللّٰه) هەیە، جا لەسەر تاکەی دیکەی تەرازووەکە دادەنرێ، پاشان هەموو هەڵە و گوناهەکانی هەڵدەدات بە لای ڕاست و چەپدا) .

: الترمذي بە ژمارە (٢٦٣٩) هێناویەتی و لە بارەیەوە دەڵێ : ئەم فەرموودەیە حسن و غریب ە لەم ڕووەوە .

## باب : ١٥

## ئيمان هێنان بەوەی الله لەگەڵ بەندەکانی قسە دەکات لە ڕۆژی قیامەت،

## مەبەستم : ئیماندارانە،

## لە نێوان الله و ئەواندا هیچ وەرگێڕێك بوونی نییە .



**١٩٣** - لە ابو بكر بن ابي موسى الاشعري ـەوە، وتی : لە ابن مسعود ـەوە رضي الله عنه فەرمووی : الله لە ڕۆژی قیامەتدا ڕەحمەت و سیتر و پاراستنی خۆی ڕادەگەیەنێت بۆ سەر بەندە ئیماندارەکەی، وە ناو دەستی فراوان دەکات، ئینجا دەفەرموێت : ئەی نەوەی ئادەم ئەوە چاکەیەکە کردوتە لە ڕۆژێکی ئاوا و ئاوادا، وە لە شوێنێکی ئاوا و ئاوادا، وە لە کاتێکی ئاوا و ئاوادا، وە بە ڕاستی لێم قەبوڵ کردیت، بۆیە سوجدە دەبات - واتە بەندەکە سوجدە دەبات - .

وە ئەمە خراپەیەکە کردوتە لە ڕۆژێکی ئاوا و ئاوادا، وە لە شوێنێکی ئاوا و ئاوادا، وە لە کاتێکی ئاوا و ئاوادا، وە بەڕاستی لەوەت خۆش بووم، بۆیە سوجدە دەبات .

پاشان دروستكراوەكان دەڵێن : خۆشبەختی بۆ ئەم بەندە چاكەكارە كە هیچ نابینێت لە نامەی كردەوەكانی جگە لە چاكە لەبەر زۆری سوجدە بردن .

---

: سەنەدەكەی منقطعة، چونكە ابو بكر بن ابي موسى الاشعري لە ابن مسعود ەوە هیچی نەبیستووە، بەڵام مەتنەكەی شەواهیدی هەیە .

**١٩٤** - وە لە عبدالله بن عُكَيم ەوە، وتی : گوێم لە ابن مسعود رضي الله عنه سەیری لای ڕاستی دەكرد پێش فەرموودە، جا فەرمووی : سوێند بە الله هیچ كەس لە ئێوە نییە ئیللا پەروەردگاری بە تەنیا لەگەڵی دەدوێت لە ڕۆژی قیامەت، هەروەكو چۆن یەكێك لە ئێوە بە تەنیا لەگەڵ بەچكە ئەسپەكەی دەبێت، دەفەرمووێت : ئەی نەوەی ئادەم چی تۆی لە خشتە برد بەرامبەر بە من؟ ئەی نەوەی ئادەم چیت كرد بەو عیلمەی كە دەتزانی؟ چیت وەڵامی پێغەمبەران دایەوە؟

# باب : ١٦

## ئیمان هێنان بە حەوزی کوثر، وە ئەوەی کە ئیمانداران لێی دەخۆنەوە بەبێ کافرەکان لە ڕۆژی قیامەتدا



**١٩٥** - پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (حەوزەکەم وەکو نێوانی عەدەن و عەممان وایە، ساردترە لە بەفر، وە شیرینترە لە هەنگوین، وە بۆنیشی خۆشترە لە میسك، کوپەکانی وەکو ئەستێرەکانی ئاسمان وان، هەر کەسێك قومێکی لێ بخواتەوە ئەوا هەرگیز دوای ئەوە تینووی نابێت) .

---

: عەدەن شارێکە لە یەمەن، عەممانیش پایتەختی الأردن.ـە لە ئێستادا .

**١٩٦** - وە لە دەربڕینێکی دیکەدا : (وە دوو ئاوەڕۆشی تێدایە، دانەیەکیان زیوە، ئەوەی دیکەیان زێڕە) .

**١٩٧** - وە موعتەزیلە بە درۆی دەخەنەوە، وە دەڵێن : چۆن هەموو ئوممەتەکەی تێر ئاو دەکات؟

ئێمەش دەڵێین : دەکرێت فریشتەکان یارمەتیدەری بن .

---

: واتە ئەوان پێیان سەیرە کە پێغەمبەر ﷺ لەو حەوزە بداتە هەموو ئوممەتەکەی، واتە پێی ڕاناگا بە عەقڵی ئەوان .

**١٩٨** - وە وتراوە : چوار پایەی هەیە کە چوار جێنشینە ڕێنمونیکراوەکانی لەسەرە و ئاو دەدەن بە خەڵکی .

# باب : ١٧

## ئيمان هێنان بە سزای ناو گۆڕ وە پرسیار کردنی منکر و نکیر علیهما السلام



**١٩٩** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (الله وەحی بۆم نارد کە ئێوە تاقیدەکرێنەوە لە گۆڕەکانتاندا) .

**٢٠٠** - لە انس بن مالك ـەوە رضي الله عنه، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە مردووەکانتان نەنێژن، ئەوا داوام لە الله دەکرد کە سزای گۆڕتان پێ ببیستێت) .

**٢٠١** - لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە بە عمر بن الخطاب رضي الله عنه ی فەرموو : (چۆن دەبیت لە گۆڕدا کاتێك منکر و نکیر هاتنە نێو گۆڕەکەت؟) .

وتی : ئەی پێغەمبەری الله ﷺ، من ئەو کات بەم شێوەیە دەبم کە ئەمڕۆ لەسەریم؟ - والله اعلم، واتە هۆشم لەلای خۆم دەبێت؟ - .

فەرمووی : (بەڵێ) .

وتی : من بۆیان بەس دەبم بە ئیزنی الله تعالی .

---

: سەنەدەکەی بچڕانی تێدایە لە نێوان لیث و البراء بن عازب .

٢٠٢ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەندە کاتێك دەخرێتە گۆڕەکەیەوە، و هاوەڵەکانی جێی دەهێڵن، ئەوا گوێی لە تەپەی پێڵاوەکانیان دەبێت، دواتر دوو فریشتە دێنە لای و دایدەنیشێنن، پاشان دەفەرموون : چیت دەوت سەبارەت بەو پیاوە؟

فەرمووی : ئەمما ئیماندار دەڵێت : شاهێدی دەدەم کە ئەو بەندە و نێردراوی الله یە .

فەرمووی : پاشان پێی دەوترێت : تەماشای جێگەکەت بکە لە ئاگردا، بە ڕاستی الله بۆی گۆڕیت بە جێگەیەك لە بەهەشتدا) .

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (ئینجا هەموویان دەبینێت، - واتە هەردوو جێگەکە، والله اعلم - ).

قتادة دەڵێت : وە بۆمان باس کراوە کە گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێت بە ئەندازەی شەست قوڵ، وە بۆی پڕ دەکرێت لە سەوزایی هەتا ڕۆژی زیندوو بوونەوە .

- ابن البناء دەڵێت - : ئەمە فەرموودەیەکی صحیح ە لە فەرموودەی : قتادة، لە انس ەوە.

مسلم دەریهێناوە بە نازلی لە عبد بن حمید، لە یونس بن محمد، لە شیبان ەوە .

---

: كه دەڵێت بە نازلی مەبەستی سەنەدی فەرموودەکەیە، کە هەتا ژمارەی ڕاویەکان زیاتر بن نازلتر دەبێت وە کەمتر بن عالیتر دەبێت .

٢٠٣ - وە موعتەزیلە ئینکاری لە سزای گۆڕ دەکەن، وە لە زیندووبوونەوەی مردووان لە گۆڕەکانیان، وە پرسیارکردنی منکر و نکیر یش .

٢٠٤ - وە ابن جرير وتی : سزا دەدرێت لە گۆڕەکەیدا بەبێ ئەوەی ڕۆحەکەی بۆ بگێڕدرێتەوە، وە هەست بە ئازار دەکات، ئەگەر چی زیندووش نەبێت .

٢٠٥ - وە لای ئێمە سزا دەدرێت دوای ئەوەی ڕۆحەکەی بۆ دەگێڕدرێتەوە و بەڵگەشمان فەرمایشتی الله یە عزَّوَجَل : ﴿ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ٤٦ ﴾ [غافر] .

وە زانراوە کە ئاگریان نیشان نادرێت لە کاتێکدا ئەوان زیندوون لەسەر زەوی، وە هیچ بەیانیان و ئێوارانێك لە قیامەت بوونی نییە، ئەوجا ثابت دەبێت کە لە گۆڕەکانیاندا نیشانیان دەدرێت .

وە هەروەها فەرمایشتی الله تعالى : ﴿ فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا ١٢٤ ﴾ [طه] .

٢٠٦ - وتراوە لە تەفسیرەکەیدا : سزای گۆڕە - واتە تەفسیری ئایەتی ١٢٤ ی طه - .

وه نمونەی ئەو : ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡقَوۡلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ ۝٢٧ ﴾ [ابراهيم] .

**٢٠٧** - ابن جرير وتی : وه هەروەکو چۆن سەرخۆش ئازاری پێدەگات و هەستی پێ ناکات، دەکرێت مردووش ئازاری پێ بگات ئەگەر چی هەستیشی پێ نەکات .

وتمان : ئەمە وتەیەکی خراپە، چونکە ئازار ناچێژێت و لەززەت نابینێت ئیللا زیندوویەك نەبێت، تەنانەت ئەگەر ئەمە وەسفێکیش بێ بۆ ژیان .

ئەمما سەرخۆش ئازاری پێدەگات، بەڵام شتێکی لەگەڵە کە ڕێگری لێ دەکات لەوەی پێی ڕابگەیەنێ، جا لەبەر ئەمەیە کە هۆشی هاتەوە ئازارەکەی زیاد دەکات .



## بەشێك

وە گوشینی گۆڕ - گۆڕەوشار - کە ڕیوایەتی صحیح هەیە لە بارەیەوە لە :

**٢٠٨** - فەرموودەی سعد بن معاذ رضي الله عنه وە ئەوەی کە گۆڕ گوشینی هەیە.

**٢٠٩** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەر کەسێك لە شەوی هەینیدا دوو ڕکعەت شەونوێژ بکات کە لە دوو ڕکعەتەکەدا فاتحة ی تێدا بخوێنێ، لەگەڵ ﴿ إِذَا زُلْزِلَتِ ﴾ پانزە جار بخوێنێ : ئەوا الله پارێزراوی دەکات لە سزای گۆڕ) .

**٢١٠** - وە ئەگەر وترا : جا چی دەڵێن دەربارەی لە خاچ دراو، و سوتێنراو، وە کەسێك کە دڕندە خواردوویەتی، وە ئەوەش کە غەرق بووە لە ئاودا ؟ - واتە ئەوانەی کە گۆڕیان نییە - .

دەوترێت - لە وەڵامدا - : پێغەمبەر ﷺ باسی گۆڕ و حاڵی مردووانی تێدا کردووە؛ لەبەر ئەوەی زاڵە - واتە لەبەر ئەوەی زۆربەی مردووان گۆڕیان هەیە - .

ئەمما ئەو حاڵەتانە ڕێگر نییە لە دروستبوونەوەی ژیان دوای مردن لەگەڵ مانەوەیدا - والله اعلم، واتە مانەوەی جەستە - .

وە ڕێگر نییە لێ ئەگەر چی بەشەکانی جەستەی جودا بووبوون و بگاتە سەر هەر یەکێکیان، وە ئەوەش کە بکرێ هەر بەشەی جەستەی بە جیا وەری بگرێت؛ جا یان سزا وەردەگرێت، یان نیعمەت و خۆشگوزەرانی .

وە ڕێگر نییە لە قودرەتی الله کە زەوی هەڵواسراوێك بگوشێت، وە لە پرسیارکردنی دوو فریشتەکە بۆ کەسێك کە پارچە پارچە کراوە، وە هەر کەس ئینکاری لەوە کرد کە لە سزای گۆڕ و مەسائیلەکانی باسمان کرد لە هەر حاڵەتێکدا ئەوا یەکسانە بەوەی کە ئینکاری ئەوەی کردووە کە پەروەردگارمان مردووان زیندوو بکاتەوە، و هەموو موعجیزەیەکیش کە الله نیشانی پێغەمبەرەکەی داوە؛ چونکە ئەوانە هیچ مەجالێکی بۆ عەقڵ تێدا نییە، وە هەر کەس بەم شێوەیە بێت ئەوە گومڕابووە لە ڕێی ڕاست .

**٢١١** - وە ئەگەر وترا : جا چی دەڵێی سەبارەت بە منداڵان و شێتەکان؟

دەوترێت : ئەوان لەو شتانە پارێزراون، لەبەر ئەوەی تەکلیفیان لێ نەکراوە و لەسەریان نییە .

---

: ڕوونکردنەوە لەسەر ئەثەری ٢١١ :

ابن تيمية لە (مجموع الفتاوى - ٤/٢٨٠) دەڵێت : ئەمما هەر کەس تەکلیف لێکراو نەبێ وەکو منداڵان و شێتەکان، ئایا تاقیدەکرێتەوە لە گۆڕەکەیدا و منکر و نکیر لێی دەپرسن؟ سەبارەت بەمە دوو وتە هەیە :

یەکەمیان : بەڵێ تاقیدەکرێتەوە، و ئەمە قسەی زۆربەی ئەهلی سوننەیە، ابو الحسن بن عبدوس لێوەی باس کردوون، وە ابو حكيم النهرواني و غەیری ئەمانیش .

دووەمیان : تاقی ناکرێنەوە لە گۆڕەکانیان، هەر وەکو ئەوەی قاضي ابو يعلى، و ابن عقیل و غەیری ئەمان باسی کردووە، وتویانە لەبەر ئەوەی تاقیکردنەوە بۆ کەسێکە کە تەکلیف لێکراو بووە لە دونیا - قسەکانی ابن تیمیة لێرەوە کۆتایی هات - .

جا ئەوانەی یەکەم بەڵگە بە ئەثەرەکەی (الموطأ : ٢٢٨/١) دێننەوە کە صحیحە، دەڵێت : لە یحي بن سعید وە کە وتویەتی : گوێم لە سعید بن المسیب بوو دەیوت : نوێژی مردووم لە پشت ابو هریرة کرد لەسەر منداڵێك کە هەرگیز هەڵەیەکی نەکردبوو، ابو هریرة دەیوت : (یا الله پەنای بدە لە سزای گۆڕ) .

**٢١٢** - جا ئەگەر وترا : ئایا منکر و نکیر دادەبەزنە سەر پێغەمبەر ﷺ ؟

وترا :

**٢١٣** - ابو الحسن التميمي وتی : دادەبەزنە سەری، و پرسیاری لێ دەکەن .

**٢١٤** - وە القاضي ابو علی بن ابی موسی وتی : دانابەزنە سەری؛

**٢١٥** - لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر علیه الصلاة و السلام : (بە من تاقیدەکرێنەوە، وە سەبارەت بە من پرسیارتان لێ دەکرێ) .

---

ڕوونکردنەوە دەربارەی خاڵی ٢١٣ و ٢١٤ / ئەو دوانەی کە ئەمەیان ووتووە هەردووکیان خەلەفن و ئەوەندەی زانیاریم هەبێت لە هیچ پێشەوایەکی سەلەف ـەوە نەهاتووە باسی ئەوەی کردبێت کە منکر و نکیر دادەبەزن یاخود دانابەزنە سەر پێغەمبەران ( علیهم الصلاة والسلام ) ، جا بۆیە ئێمەش دەوەستین و هەر کاتێکیش پرسیارمان لێکرا دەربارەی ئەو بابەتە ، لە وەڵامدا دەڵێین نازانین ، شتێك ناڵێین کە سەلەفمان نەبێت تیایدا هەر وەکو پێشەوا أحمد ـی کوڕی حنبل بە عبدالملك الميموني فەرمووە : دوور بکەوە لەوەی قسە بکەی لە بابەتێکدا کە پێشەوایەکت تێیدا نەبێت ، جا بۆیە ئێمەش هەر ئەوە دەڵێین کە سەلەف ووتوویانە و لەو شوێنەدا دەوەستین کە ئەوان تێیدا وەستاون ، وبالله التوفيق .

# باب : ١٨

## ئیمان هێنان به شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ کۆمەڵێك له موەحیدان که له ئاگر دێنەدەر



٢١٦ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (سەرپشك کرام له نێوان شەفاعەت، وه له نێوان ئەوەی بەشێك له ئوممەتەکەم بچێته بەهەشت، جا شەفاعەتم هەڵبژارد، چونکه گشتگیرتر و کافیتره .

ئایا ئێوه وادەزانن بۆ ئیمانداره تەقوادارەکانه؟

نەخێر؛ بەڵکو بۆ ئەنجامدەرانی گوناه و هەڵەیه) .

---

: ئەم لەفزه لای زانایان صحیح نییه، بەڵام هەتا ئەو شوێنەی که دەڵێ شەفاعەتم هەڵبژارد صحیحه.

٢١٧ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (من یەکەم شەفاعەتکارم له بەهەشتدا) .

**٢١٨** - رسول الله ﷺ فەرمووى : (داواى الوسيلة م بۆ بكەن، هيچ بەندەيەك داواى ئەوە بۆ من ناكات ئيللا من بۆى دەبمە شەفاعەتكار، ياخود شاهێد لە ڕۆژى قيامەتدا) .

---

: دوعاى الوسيلة ئەوەيە كە لە دواى بانگ دەخوێندرێت : **اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَ ابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْته** .

**٢١٩** - محمد بن على، وتى : جابر بن عبدالله رضي الله عنه بۆى گێڕامەوە، وتى : گوێم لە رسول الله بوو ﷺ دەيفەرموو : (شەفاعەتى من لە ڕۆژى قيامەتدا بۆ ئەهلى تاوانە گەورەكان لە ئوممەتەكەم) .

ئينجا وتم : ئەمە چييە ئەى جابر؟

فەرمووى : بەڵێ ئەى محمد، هەر كەس چاكەكانى زياتر بوو لە خراپەكانى ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە بەبێ لێپێچينەوە، وە هەر كەس خراپەكانى و چاكەكانى يەكسان بوون ئەوا ئەو كەسە لێپێچينەوەيەكى ئاسانى لەگەڵدا دەكرێت، پاشان دەچێتە بەهەشتەوە، وە بەڕاستى شەفاعەتى رسول الله ﷺ بۆ كەسێكە كە خۆى لە ناوبردووە، و بارى پشتى خۆى قورس كردووە - واتە بە تاوان، وە خۆى لەناوبردووە مەبەستى خۆ كوشتن نييە بەڵكو واتاى هەبوونى تاوانى زۆرە - .

**٢٢٠** - لە أبي سعيد الخدري يەوە رضي الله عنه، لە پێغەمبەر ەوە ﷺ فەرمووى:

(كە ئیمانداران لە ئاگر ڕزگاریان بوو، فەرمووی : وە هیچ کەس لە ئێوە توندتر نییە بە بەراورد بە توندی ئەو ئیماندارانە بۆ داواکردنی مافەکانیان لە پەروەردگاریان، جا دەڵێن : پەروەردگارا؛ نەوەکانمان و براکانمان لەگەڵ ئێمە نوێژیان دەکرد، وە لەگەڵمان ڕۆژوویان دەگرت .

فەرمووی : جا الله دەفەرموێت : بڕۆن هەر کەسێکتان ناسیەوە لەوان ئەوا دەریبێنن، ئەوجا دەریان دەهێنن، تێیاندایە کە ئاگر تا پێیەکانی گرتووە، وە تێیاندایە کە ئاگر تا قاچەکانی گرتووە، وە تێیاندایە ئاگر تا ئەژنۆکانی گرتووە .

فەرمووی : ئینجا دەریان دەهێنن، پاشان دەگەڕێنەوە و دەڵێن : بەڕاستی پەروەردگارا شتانێکی زۆر ئێمەی دەرهێنا .

فەرمووی : پێیان دەفەرموێت : بگەڕێنەوە جا هەر کەسێك بە ئەندازەی مسقاڵە زەڕرەیەك ئیمان لە دڵیدا هەبوو بیهێننە دەرەوە) .

ابو سعید وتی : هەر کەس لە گوماندایە بەرامبەر بەمە ئەوا با ئەم ئایەتە بخوێنێت کە لە سورەتی النساء هەیە : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا ۝٤٠﴾ [النساء] .

(فەرمووی : جا دەگەڕێنەوە و دەڵێن : بەڕاستی پەروەردگارا شتانێکی زۆر ئێمەی دەرهێنا.

فەرمووی : الله پێیان دەفەرموێت : فریشتەکان شەفاعەتیان کرد، وە پێغەمبەرانیش شەفاعەتیان کرد، وە شەفاعەتکارانیش شەفاعەتیان کرد، ئینجا أرحم

الراحمين ماوەتەوە - والله اعلم، الله شەفاعەت ناكات بەڵكو بە ڕەحمی خۆی دەریان دێنێ، چونكە شەفاعەت واتا تكا كردن - .

فەرمووی : ئەوجا مشتێك دەكات بەناو ئاگردا پاشان دروستكراوانێكی زۆر دەردەهێنێت كە هیچ چاكەیان نییە،

فەرمووی : جا دەردەچن و بوونە بە پشكۆ) .

(فەرمووی : پاشان ئاویان پێدا دەكرێت، وە پێی دەوترێ ئاوی ژیان، وەكو نەمام دەڕوێندرێن بە وێنەی ئەو تۆوانەی كە هەڵگیراون لە قوڕ و پوش و پەڵاش.

فەرمووی : پاشان دێنەدەرەوە لە جەستەكانیان هەر وەكو مرواری، لە ملیاندا ئەڵقەیەك هەیە، ئازادكراوانی الله، جا كە چونە ناوەوە پێیان دەوترێت : ئاوات بخوازن، ئینجا ئاوات دەخوازن هەتاوەكو ئاواتیان نامێنێت بۆ خواستن، پاشان دەوترێت : ئەمە و هاوشێوەی ئەمەش بۆ ئێوە، یاخود فەرمووی : دە هێندەی ئەمە) .

# بەشێك

**٢٢١** - وە شەفاعەتی پێغەمبەرمان ﷺ بۆ ئەهلی تاوانە گەورەكانە لە ئوممەتەكەی، پێچەوانەی قەدەرییەكان كە دەڵێن : شەفاعەتی نییە .

: ئەهلی علم زیاتر نەفی كردنی شەفاعەتیان بۆ موعتەزیلە گەڕاندووەتەوە، وە ئەوان نەفی قەدەریش دەكەن، بۆیە ئەم فصل ە لە ڕاستیدا ڕەددە بۆ موعتەزیلە .

**٢٢٢** - وە هەر كەس - لە موسڵمانان - بچێتە ئاگرەوە وەكو سزایەك بۆی، ئەوا لای ئێمە لێی دەردەچێت : بە شەفاعەتی ئەو، یان شەفاعەتی غەیری ئەو، وە بە ڕەحمەتی اللە عزَّوَجَل تاوەكو هیچ كەس لە ئاگردا نامێنێتەوە كە لە دونیادا یەك جار وتبێتی : (لا اله الا اللە) بە ئیخلاصەوە، وە ئیمانیشی پێی هەبووبێت؛ ئەگەرچی دوای ئەوە طاعەتەكانی ئەنجام نەدابێت .

: واللە اعلم، مەبەستی نوێژ نییە چونكە لە ئەثەری ٢٣٧ دەڵێت نوێژ لە ئیمانە و ئەوەی وازی لێ هێنا كافر دەبێ،

**٢٢٣** - وه لای قه‌ده‌رییه‌كان :

هه‌ر كه‌س تاوانێكی گه‌وره ئه‌نجام بدات، ئه‌وا له ئاگری جه‌هه‌ننه‌م دایه بۆ هه‌میشه، لێی نایه‌ته ده‌ره‌وه .

ئه‌مه وه‌كو گه‌وره‌ییه‌ك بۆ تاوانه گه‌وره‌كان .

وه ئه‌مما هه‌ر كه‌س بمرێت به موشریكی ئه‌وا بۆ هه‌میشه له ئاگری جه‌هه‌ننه‌م دایه و هه‌رگیز لێی نایه‌ته ده‌ره‌وه .



## بەشێك

**٢٢٤** - وە مردووەکان دابەش دەبنە سەر چوار بەش :

ئەوانەی کە بەهەشتیان بۆ دەبڕدرێتەوە؛ کە ئەوانیش بریتین لە : پێغەمبەران، و نێردراوانن، وە ئەوانەی کە پێغەمبەران بەهەشتیان بۆ دەبڕنەوە؛ وەکو :

**٢٢٥** - فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ : (دە کەس لە بەهەشتدان - مەبەستی موژدە پێدراوانە بە بەهەشت - ) .

وە دووەم : ئەوانەی کە ئاگریان بۆ دەبڕدرێتەوە بۆ هەتا هەتایە؛ کە ئەوانیش : کافران، و موشریکەکانن، وە ئەوانەی کە پێغەمبەران ئاگریان بۆ دەبڕنەوە .

وە سێیەم : چاکەکارانی موسڵمانان کە لە ڕووکەشدا لە ئەهلی بەهەشتن، وە ئەوان لە ژێر ویستی الله دان .

وە چوارەم : فاسقەکانی ناو موسڵمانان کە لە ڕووکەشدا لە ئەهلی ئاگرن، وە کاروباریان بۆ الله دەگێڕدرێتەوە، هەروەها ئەمانیش هەر لە ژێر ویستی الله دان .

---

: واتە ئەگەرچی موسڵمانان چاکەکار یان فاسق بن، الله خۆی دەزانێت دەیانخاتە کوێوە و کارەکە لە ژێر ویستی خۆیدایە .

**٢٢٦** - رسول الله ﷺ له ناو كۆمه‌ڵێك له هاوه‌ڵانیدا بوو، فه‌رمووی : (چی ده‌ڵێن ده‌رباره‌ی پیاوێك كه له پێناو الله دا كوژرابێت؟)

وتیان : به‌هه‌شت إن شاء الله .

فه‌رمووی ﷺ : (به‌هه‌شت إن شاء الله) .

فه‌رمووی : (چی ده‌ڵێن ده‌رباره‌ی پیاوێك كه له پێناو الله دا مردبێت؟) .

جا وتیان : الله و پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی زاناترن .

فه‌رمووی ﷺ : (به‌هه‌شت إن شاء الله تعالى) .

فه‌رمووی : (چی ده‌ڵێن ده‌رباره‌ی پیاوێك كه مرد، ئینجا دوو پیاوی دادپه‌روه‌ر هه‌ڵده‌ستن و ده‌ڵێن : (یا الله هیچی له باره‌وه نازانین جگه له خێر؟) .

وتیان : الله و پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی زاناترن .

فه‌رمووی : (به‌هه‌شت إن شاء الله) .

فه‌رمووی : (چی ده‌ڵێن ده‌رباره‌ی پیاوێك كه مرد، ئینجا دوو پیاوی دادپه‌روه‌ر هه‌ڵده‌ستن و ده‌ڵێن : (یا الله هیچ خێرێكی له‌باره‌وه نازانین؟) .

وتیان : الله و پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی زاناترن .

رسول الله ﷺ فه‌رمووی : (گوناهباره و الله ش لێخۆشبوو و میهره‌بانه) .

---

: له سەنەدی فەرموودەكە اسحاق بن ابراهيم بن نسطاس هەیە، كە ضعیف ە.

**٢٢٧** - له جندب بن عبدالله ەوە رضي الله عنه، كە رسول الله ﷺ فەرمووی : (كە پیاوێك وتی : والله الله له فڵان خۆش نابێت، وە الله فەرمووی : كێیە كە سوێند لەسەر من دەخوات كە له فڵان خۆش نابم، جا ئەوە من له فڵان خۆش بووم، و كردەوەی تۆشم پوچەڵ كردەوە) .

---

: ئەم فەرموودەیە ئەوە ناگەیەنێت كە نابێت كەس تكفیر بكرێت، چونكە تەكفیر جیایە و لەسەر ڕووكەش دەكرێت و هەر كات تەوبەی كرد بە موسڵمان دەزانرێت، بەڵام لێرە بە بێ علم سوێندی خواردەوە كە الله تەوبەی پێ نابەخشێت، والله اعلم .

**٢٢٨** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەر كەسێك الله بەڵێنی پاداشتی پێ بدات لەسەر كردەوەیەك ئەوا بۆی جێ بەجێ دەكات و پاداشتی دەداتەوە .

وە هەركەسێك الله بەڵێنی سزای پێ بدات لەسەر كردەوەیەك ئەوا بە هەڵبژاردنی خۆیەتی : ئەگەر ویستی لێ بوو دەیكات - واتە سزاكە جێبەجێ دەكات - ، وە ئەگەر ویستی لێبوو نایكات) .

**٢٢٩** - وە ئەمە قسەی احمد ە له نامیلكەكەدا .

**٢٣٠** - وە موعتەزیلە سەرپێچی لەمە دەکەن، دەڵێن : پێویستە الله بە وەفابێ بەرامبەر سزاکە و سزاکە لەسەر گوناهبارەکە جێبەجێ بکات، چونکە ناشرینە ئەگەر لێی ببورێت! وە من ئەمەم لە کتێبێکدا جیا کردووەتەوە .

: واتە بەهۆی ئەوەی کە سزای تاوانبارەکە نادات و لێی خۆشدەبێت، پێیان وایە لێبوردن بۆ ئەو کەسە ناشرینە و دەبێت سزاکەی بەسەردا بسەپێنرێت، پەنا بە الله لە قسەکانیان .

# باب : ١٩

## ئيمان هێنانە بەوەی کە مەسیحی دەججال دەردەچێت



**٢٣١** - لە عائيشة وە رضي الله عنها، کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : (يا الله پەنات پێ دەگرم لە تاقیکردنەوەی ناو گۆڕ، وە سزای ئاگر، وە پەنات پێ دەگرم لە شەڕی تاقیکردنەوەی هەژاری، وە لە شەڕی تاقیکردنەوەی دەوڵەمەندی، وە پەنات پێ دەگرم لە تاقیکردنەوەی مەسیحی دەججال، يا الله پاکم بکەیتەوە لە هەڵەکانم هەر وەکو چۆن جلی سپیت پاك کردەوە لە پیسی) .

**٢٣٢** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (دەججال کوێرە، و پەروەردگارتان کوێر نییە، وە لە نێوان چاوەکانی دەججال نوسراوە : (ك ا ف ر) هەموو ئیمانداراێك دەیخوێنێتەوە، بە خوێنەوار، و نەخوێنەواریشەوە) .

**٢٣٣** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەر کەسێك لە ئێوە لە بارەی دەججالەوە بیستی ئەوا با لێی هەڵبێت، چونکە پیاو هەیە دێت بۆ لای وا دەزانێت ئیمانداره، بەڵام شوێنی دەکەوێت لەبەر ئەو شوبهانەی کە پێیەتی) .

أبو علي ابن البناء وتی : من هەواڵەكانیم لە كتێبێكی جیادا كۆ كردووەتەوە .

# باب : ٢٠

## ئيمان زياد و كەم دەكات وە مەرجی هەیە



**٢٣٤** - پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت : (ئیمان بەڕاست خستنەوەیە بە دڵ، وە وتەیە بە زمان، وە کردەوەیە بە ئەندامەکان) .

ابو الصلت وتی : ئەگەر ئەم اسنادە بەسەر شێتدا بخوێنرێتەوە ئەوا دێتەوە هۆش خۆی.

: ئەم فەرموودەیە هەڵبەستراوە هەروەك الدارقطني لە (الموضوعات - ١٢٨/١) وتویەتی، وە ابو الصلت رافضییەکی پیسە هەر وەك الدارقطني لە (تاريخ بغداد ٥١/١١) وتویەتی، وە دیارە بۆیە ئاوا وەصفی سەنەدەکەی کردووە، چونکە سەنەدەکەی امام علی و نەوەکانی تێدایە، جا پێویست ناکات بەڵگە بە فەرموودەی هەڵبەستراو بهێنرێتەوە چونکە زانایانی سەلەف لەبارەی ئیمانەوە هەر ئەمەیان وتووە .

**٢٣٥** - وە گێڕدراوەتەوە لە ابن عباس ـەوە رضي الله عنهما کە کاتێك وەفدی عبدالقيس گەیشتنە لای پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردن بە ئیمان هێنان بە الله .

وە فەرمووی : (دەزانن ئیمان چییە؟)

وتيان : الله و پێغەمبەرەکەی زاناترن .

فەرمووی : (شایەتی دان بە لا الە الا الله، وە محمد رسول الله، وە ئەنجامدانی نوێژ، و زەکات دان، وە یەك لەسەر پێنجی غەنیمەت ببەخشن) .



**٢٣٦** - ئيمان له زمانەوانیدا بريتييه له : بەڕاست خستنەوه .

وه له شەريعەتدا بريتييه له : بەڕاست خستنەوه، وه هەموو طاعەتەكان، و واجبەكان، و نافيلەكان لەگەڵ دوور كەوتنەوه له سەرپێچی .

وه وتەيه به زمان، و ناسينه به دڵ، و كردەوەيه به ئەندامەكان .

---

: نافيله واته ئەو كردارەی ئەگەر نەيكەی گوناهبار نيت وه ئەگەر بيكەی پاداشتت بۆ دەنوسرێ، وەكو شەونوێژ، كه نافيله ئێسته به سوننەتەكان ناسراوه .

**٢٣٧** - وه ئەوه سێ جۆره :

يەكەم : ئەوەی كه واز لێهێنەرەكەی تەكفير دەكرێت - واته گەر وازی لێهێنيت كافر دەبيت - ؛ كه بريتييه له ناسين، وه بەڕاست خستنەوه، وه نوێژ كه هاتووه له دوو له صحيحترين ڕيوايەتەكان؛ چونكه الله ناوی ناوه ئيمان - واته ناوی له نوێژ ناوه - ، هەروەكو فەرموويەتی : ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمۡ ﴿١٤٣﴾ ﴾ [البقرة]

واتە : ئەو نوێژانەتان کە ڕوو لە بیت المقدس کردبووتان - الله ئەم ئایەتەی دوای گۆڕینی قیبلە لە بیت القدس ـەوە بۆ کعبە دابەزاند و بە ئیمانداارانی فەرموو ئەو نوێژانەتان کە ڕوو لە بیت المقدس کردووتانە نەفەوتاوە، جا لە ئایەتەکە نوێژی بە ئیمان ناو بردووە - .

**٢٣٨** - وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (لە نێوان ئیمان و کوفردا هیچ شتێك بوونی نییە جگە لە نوێژ، جا هەر کەسێك واز لە نوێژ بهێنێت ئەوا کوفری ئەنجام داوە) .

---

: فەرموودەکە صحیح ە و کوفرەکەش بە ئیجماعی ماوەڵان . ە

وە دووەم : بە فاسق دادەنرێت بەڵام تکفیر ناکرێت؛ وەکو وازهێنان لە : زەکات، و ڕۆژوو، و حەج، وە جگە لەمانە لە واجبەکان .

وە سێیەم : بە فاسق دانانرێت، وە تکفیر ناکرێت، وەك وازهێنان لە نافیلەکان بەڵام نەك لە ڕووی بەردەوامییەوە .

---

: امام مالك لە (المحلی - ٢٣١/٢) دەربارەی نوێژی وتر دەڵێت : فەڕز نییە، بەڵام هەر کەس وازی لێ هێنا تەئدیب دەکرێت، وە ئەمە برینێکە لە شەهادەکەیدا .

**٢٣٩** - بە پێچەوانەی جەهمیەکانەوە؛ کە دەڵێن : ئیمان تەنها ناسینە .

**٢٤٠** - وه پێچەوانەی ئەشعەرییەکان؛ کە دەڵێن : طاعەتەکان لە ئیمان نین؛ بەڵکو ئیمان تەنیا بەڕاست خستنەوەیە .

: ابن تيمية لە (مجموع فتاوی - ١٢٠/٧) دەڵێت : وە ابو الحسن الأشعري قسەکەی جەهمی سەرخست لەبارەی ئیمانەوە، وە قسەکەی جەهم وتەیەکە هیچ کەس لە پێشەوایانی ئەهلی سوننە نەیان وتووە، بەڵکو احمد بن حنبل و وكيع و جگە لەوانیش تەکفیری ئەو کەسەیان کردووە کە قسەکەی جەهمی کردووە کە ابو الحسن یش ئەوەی سەر خستووە، وە لای ئەوان ئەم وتەیە خراپترە لە وتەی مورجیئەکان .




دەربارەی فاسقێك كە بۆ ماوەیەكی درێژە فاسقە : كەسێكە كە بەڕاست خستنەوەی بە دڵ و بە وتە لێ بینراوە، بەڵام طاعەتەكانی واز لێهێناوە جگە لە نوێژ، وە خراپە و مونكەری ئەنجام داوە، ئایا ناو دەنرێت ئیماندار؟

**٢٤١** - ڕووكەشی وتەكانی أحمد بریتییە لە : ناو دەنرێت ئیماندارێكی كەم ئیمان، وە ناوەكەی لێ ناسەنرێتەوە - واتە ناوی ئیماندار، والله اعلم - ، بەڵكو دەوترێت : ئیماندارە بە ئیمانەكەی، وە فاسقە بە تاوانە گەورەكەی .

**٢٤٢** - پێچەوانەی موعتەزیلە؛ كە دەڵێن : نابێتە ئیماندار، وە نابێتە كافر؛ بەڵكو دەبێتە فاسق .

**٢٤٣** - وە پێچەوانەی ئەشعەرییەكان؛ كە دەڵێن : ئەو ئیمانی كامڵە .

ئەم قسەیەشیان بونیاد ناوە لەسەر ئەوەی كە دەڵێن ئیمان تەنها بەڕاست خستنەوەیە.

## بەشێك

**٢٤٤** - وە ئیمان زیاد دەكات بە ئەنجامدانی طاعەت، وە كەم دەكات بە ئەنجامدانی سەرپێچی : خودی خۆی و پاداشتەكەشی - واتە هەم ئیمان كەم و زیاد دەكات، وە هەمیش پاداشتەكەشی، بەپێی ئیمانەكە - .

**٢٤٥** - پێچەوانەی موعتەزیلە كە دەڵێن : زیاد ناكات و كەم ناكات .

**٢٤٦** - وە پێچەوانەی ئەشعەریەكان كە دەڵێن : پاداشتەكەی زیاد و كەم دەكات نەك خودی خۆی .

**٢٤٧** - بەڵگەمان :

فەرمایشتی الله تعالى ە : ﴿ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا ۝٢ ﴾ [الأنفال] .

وە فەرمایشتی : ﴿ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَٰنًا ۝٣١ ﴾ [المدثر] .




**٢٤٨** - وە نابێت بڵێت : من ئیمانداری ڕاستەقینەم .

بەڵکو دەبێت بڵێت : من ئیماندارم إن شاء الله .

**٢٤٩** - پێچەوانەی موعتەزیلە .

**٢٥٠** - بەڵگەمان : کۆدەنگی سەلەفە .

**٢٥١** - گێڕدراوەتەوە لە عمر بن الخطاب ەوە رضي الله عنه، کە فەرموویەتی : هەر کەس پێی وابێ کە ئیماندارە - واتە بڵێ من ئیماندارم - ؛ ئەوا کافرە .

---

: اسنادی ئەم ئەثەرە منقطع ە و صحيح نييە .

**٢٥٢** - وە لە ابن مسعود ەوە رضي الله عنه، پێی وترا : فلان دەڵێت : من ئیماندارم.

فەرمووی : لێی بپرسن؛ ئایا لە بەهەشتە یان لە ئاگر؟

ئینجا لێیان پرسی؛ پاشان پیاوەکە وتی : الله زاناترە .

فەرمووی : ئایا بۆ یەکەمیش الله ـت کردە وەکیل هەروەکو چۆن بۆ ئاخیرەت کردت؟

: كاتێك كه بەبێ جیاكاری [استثناء] واته به بێ وتنی (إن شاء الله) دەڵێیت : ئیماندارم . ئەمه دەبێته جورئەت لەسەر الله، تۆ چوزانی الله ئیمانەكەت لێ قبوڵ دەكات؟

چوزانی دەچیته ئاگر یان بەهەشت؟

بۆیه كه دەڵێی إن شاء الله مەبەستت له گومان نیه له ئیمانەكەت، هەروەكو مورجیئه ناو له ئەهلی سوننه دەنێن (الشكاك) واته خاوەن گومانەكان، درۆ دەكەن چونكه لای ئەهلی سوننه گومان له ئیمان كوفره، بەڵكو مەبەست ئەوەیه ئەو جورئەته نەكەیت بەرامبەر الله، والله اعلم .

## بەشێك

٢٥٣ - وە هەموو موسڵمانێك ئیماندار نییە .

٢٥٤ - پێچەوانەی موعتەزیلە .

٢٥٥ - بەڵگەمان : فەرمایشتی الله تعالی : ﴿ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا ﴿١٤﴾ ﴾ [الحجرات] .

وە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴿٣٥﴾ ﴾ [الأحزاب] .

جا جیاكاری كرد لە نێوان ئیمان و ئیسلامدا، وە هیچ شتێك لە خودی خۆی جیا ناكرێتەوە .

---

: واتە بە واوی عطف لە ئایەتەكە موسڵمانانی جیاكردەوە لە ئیمانداران، وە مەبەستی ئەوەیە ئەگەر هەمان شت بوونایە ئەوا جیای نەدەكردنەوە .

**٢٥٦** - وە گێڕدراوەتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کاتێك جبريل پرسیاری لێکرد سەبارەت بە ئیسلام، لە وەڵامدا فەرمووی : (ئەوەیە شاهێدی بدەی کە هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق کە شایەنی پەرستن بێ جگە لە الله، وە محمد پێغەمبەری الله یە، وە نوێژ دابەستیت، و زەکات بدەیت، وە ڕۆژووی ڕەمەزان بگریت، و حەجی البیت - كعبة - بکەیت ئەگەر توانای ڕێگاکەیت هەبوو) .

فەرمووی : ئەی ئیمان چییە؟

فەرمووی : (ئیمان بهێنی بە الله، وە فریشتەکانی، وە کتێبەکانی، وە پێغەمبەرانی، وە بە زیندوو بوونەوە دوای مردن، وە بەهەشت و ئاگر، وە بە قەدەر بە خێر و بە شەڕییەوە) .

کەواتە جیاکاری کرد لە نێوانیان .

# باب : ٢١

# ئیمان هێنان بە صراط و کورسی و ترسی ڕۆژی قیامەت



**٢٥٧** - لە عائیشة وە رضي الله عنها، وتی : یا رسول الله ﷺ : ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ﴿٤٨﴾ ﴾ [إبراهيم]، خەڵکی لە کوێن ئەو ڕۆژە ئەی پێغەمبەری الله ﷺ ؟

فەرمووی : (لەسەر صیراط ن ئەی کچەکەی الصدیق) .

**٢٥٨** - وە صراط پردێکی درێژکراوەیە لەسەر جەهەننەم؛ باریکترە لە موو، وە تیژترە لە شمشێر .

**٢٥٩** - بەپێچەوانەی موعتەزیلە کە ئەوەیان لا باتڵە؛ وە وتیان : مەحاڵە سیفەتەکانی لەبەرچاومان کە خەڵکی لەسەری بڕۆن .

: واته پێیان وایه كه ناكرێت خەڵكی لەسەر شتێك بڕۆن باریكتربێ له موو، وه تیژتربێ له شمشێر، بەڵام ئەوه شتێكه ویستی الله ی لەسەره و مرۆڤیش تەنیا تەسلیم بوونی لەسەره نەك بیركردنەوه لێی .

**٢٦٠** - وه بەڕاستی الله و پێغەمبەرەكەی موعتەزیلەیان به درۆ خستوەتەوه .

الله تعالى فەرموویەتی : ﴿ فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ ﴾ [الصافات]، وه غەیری ئەمه .

وه نەك ئەوەی هەموو شتێك ئەگەر نەیبینین به چاوی خۆمان ئەبێ پێی جاهیل بین، وه لەبەر ئەوەی كه ئێمه دەبینین الله ئەو باڵندە قورسانه به هەواوه ڕادەگرێت .

پاشان دەڵێین : ئاسانه لەسەر ئیماندار، وه قورسه لەسەر كافر - واته باوەڕهێنان بەو شتانەی كه نەماندیون بەڵام لەقورئان و سوننەت هاتوون كه باس له بوونیان دەكەن - .

جا كەسی خۆشبەخت : با هەڵی دەگرێت، یان لوطفێك له لوطفەكانی، وه بەدبەخت : لێی دەكەوێته خوارەوه .

وه هەر كەس چاكەی به خراپه تێكەڵ كرد : ئەوا الله ڕێگری لێ دەكات له كەوتنه خوارەوه لەبەر ئەو چاكانەی هەیەتی .



٢٦١ - وه كورسى دادەنرێت به نيشانەيەك بۆ لێپرسينەوه - واته لێپرسينەوه لەگەڵ بەندەكان - ؛ هەر وەكو چۆن خۆر دادەنرێت به نيشانەيەك بۆ كاتەكانى نوێژ .

وه ترسەكەی ڕۆژی قیامەت سەخت؛ بەڵام الله ئەوه لەسەر ئیمانداران ئاسان دەكات نەك لەسەر كافران، هەروەك الله تعالى فەرموويەتى : ﴿وَهُم مِّن فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ ءَامِنُونَ ﴿٨٩﴾﴾ [النمل] .

---

: ئەم ئەثەرەی كه لێره باس كراوه و ئەوەش كه ابن عباس دەڵێت : كورسی جێی پێیەكانی الله یه دوو شتی جیاوازن، لێره ئەم وتەیه له تەفسیری ئایەتی : ﴿**هَلْ يَنْظُرُونَ إِلَّا أَنْ يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِنَ الْغَمَامِ**﴾ [البقرة : ٢١٠]

كه به فەرموودەیەكی مرفوع له پێغەمبەرەوه ﷺ تەفسیر كراوه، كه دەفەرمووێت : (الله ئەوانەی سەرەتا و كۆتایی كۆ دەكاتەوه بۆ ماوەی چل ساڵ له ڕۆژێك كه كاتەكەی دیاری كراوه كه چاویان ئەبڵەق بووه بەرەو ئاسمان چاوەڕوانی بڕیاردانن، وه الله دێته خوارەوه له پەڵه هەورێكی تەنكدا له عەرشەوه بۆ كورسی) رواه ابن منده في [الإيمان : ٨٤٤] و صححه

ئينجا ئەم ئەثەرە تەنها باسی ئەوە دەكات كە كورسی نيشانەيەكە بۆ حەشر و حيساب، نەك باسی ئەوە بكات كە كورسی چ شتێكە، بۆيە وا تێمەگەن كە نوسەر قسەيەكی دژ بە ئەثەرەكەی ابن عباس كردبێ، والله اعلم .

# باب : ٢٢

# وە ئیمان هێنان بە الصور، و پرد، و لێپرسینەوە



**٢٦٢** - لە ابن عباس ـەوە رضي الله عنهما : ﴿ فَإِذَا نُقِرَ فِي ٱلنَّاقُورِ ۝٨ ﴾ [المدثر]

رسـول الله ﷺ فەرمووی : (چۆن لە نا زو نیعمەتدا بژیم؛ لە کاتێکدا خاوەنی کەڕەنا و شـەیپووڕ - واتە ئیسرافیل - شـەیپووری بەدەستەوەیە و خۆی چەماندووەتەوە، و گوێ دەگرێ بۆ ئەوەی بزانێت کەی فەرمانی پێ بکرێ بۆ ئەوەی فووی پیادا بکات) .

پاشـان هاوەڵانی رسـول الله ﷺ وتیان : ئەی چی بڵێین؟

فەرمووی : (بڵێن الله مان بەسە و باشترین کەسە کارەکانمانی پێ بسپێرین، وە پشتمان بەو بەستووە) .

**٢٦٣** - رسـول الله ﷺ فەرمووی : (خاوەن شـەیپووڕ ئاوڕی نەداوەتەوە لەوەتەی ئەو کارەی پێ سپێردراوە، ئامادەیە و ڕووی لە عەڕشە و سـەیری عەڕش دەکات؛ لە ترسی ئەوەی نەکا فەرمانی پێ بکرێت بە فوو کردن پیایدا پێش ئەوەی کە ئاوڕ دانەوەکەی تەواو بکا، وە چاوەکانی وەکو دوو هەسارەی پڕشنگدار وایە) .

## بەشێك

**٢٦٤** - وە ئیمان هێنان بە گەڕاندنەوەی تەكلیف لێكراوان، و منداڵەكانیان، وە بە زیندووبوونەوەیان لە گۆڕەكانیانەوە بۆ شوێنی وەستانەكە : واجبە لە ڕووی شەرعەوە .

**٢٦٥** - أحمد بن حنبل لە ڕیوایەتی الأنطاكي دەڵێت : الله بەندەكانی لە ڕۆژی قیامەت بە سێ تایبەتمەندی زیندوو دەكاتەوە :

١ - چاكەكارێك كە هیچی لەسەر نییە؛ چونكە الله دەفەرمووێت : ﴿ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ﴿٩١﴾ ﴾ [التوبة] .

٢ - وە كافرێك كە لە ئاگردایە؛ چونكە الله دەفەرمووێت : ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا۟ ﴿٣٦﴾ ﴾ [فاطر] .

٣ - وە ئەوانەی خاوەن هەڵە و گوناهن؛ كاروباریان بۆ الله دەگەڕێنرێتەوە؛ ئەگەر ویستی لێبوو سزایان دەدات، وە ئەگەر ویستی لێبوو لێیان خۆش دەبێت؛ چونكە الله تعالى دەفەرمووێت : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ

﴿٤٨﴾ [النساء] .

**٢٦٦** - وه مولحيدەكان، و ئەهلى التناسخ وتيان : هەر كەس بمرێت هەرگيز ناژيێتەوە.

وه وتيان : جا ئايا پارچەكانى مرۆڤ دەگەڕێتەوە، يان بەشێكى، يان هاوشێوەكەى، ياخود دەبێتەوە بە هەمان شت؟

---

: ئەهلى التناسخ : ئەوانەن كە پێيان وايە ڕۆحەكان كۆپى دەبنەوە لە جەستەكاندا وە لە كەسێكەوە بۆ كەسێكى تر دەگوازرێتەوە، كە مەزهەبێكى كۆنى هينديیە .

**٢٦٧** - وه الله سبحانه و تعالى ئەوانى بە درۆ خستەوە؛ فەرمووى : ﴿ يَوۡمَ نَحۡشُرُ ٱلۡمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ وَفۡدٗا ﴿٨٥﴾ ﴾ [مريم]، وه فەرموويەتى : ﴿ ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ﴿٢٢﴾ ﴾ [الصافات]، وه فەرموويەتى : ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡعَثُ مَن فِي ٱلۡقُبُورِ ﴿٧﴾ ﴾ [الحج] .

چونكە لاشەى مرۆڤ كاتێك نەهێڵرێت دەگەڕێتەوە بۆ حاڵى سەرەتاى ئەو كاتەى كە هەر بوونى نەبووە، جا ئەگەر الله بتوانێ لە نەبوونەوە دروستى بكات ئەوا دەشتوانێ دووبارە دروستى بكاتەوە كاتێك دەمرێت و بوونى نامێنێت .

وه الله هەواڵى سەبارەت بەمە داوە، كە فەرموويەتى : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن

كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّنَ ٱلْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ۝٥ ﴾ [الحج]

جا ئیمانداران دەگەڕێنێتەوە سەر سیفەتەکانیان، و تەواوی هەستەکانیان.

وە کافرەکان بە کوێری دەگەڕێنێتەوە، هەروەکو فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ ۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا ۝٩٧ ﴾ [الإسراء].

**٢٦٨** - وە شێتەکان، و ئاژەڵانیش دەگەڕێنێتەوە، وە قەرەبوو کردنەوە لە نێوانیاندا جێگیرە.

: واتە جێگیرە لە فەرموودەی صحیح کە حەق لە ئاژەڵانیش وەردەگیرێتەوە لە نێوان خۆیاندا و بۆیان قەرەبوو دەکرێتەوە.

**٢٦٩** - أبو هريرة رضي الله عنه، وتی: گوێم لە رسول الله ﷺ بوو دەیفەرموو: (الله دادوەری لە نێوان دروستکراوەکانی دەکات: لە جن، و مرۆڤ، و ئاژەڵان، وە لەو ڕۆژەدا حەق لە بزنی شاخدار دەسەنێتەوە - واتە حەق بۆ بێ شاخ دەسەنێتەوە لە شاخدار -، پاشان پێی دەفەرمووێت: ببەرەوە بە خۆڵ، جا لەو کاتەدا کافر دەڵێت: ﴿ يَٰلَيْتَنِى

كُنتُ تُرَٰبَۢا ﴿٤٠﴾ [النبأ] . - واته كافر ئاوات دەخوازێت وەكو ئاژەڵ ببێتەوە بە خۆڵ لە ترسی سزای دۆزەخ - .

وە دەبێت ئیمان بەمانە بهێنرێ هەر وەكو لە شەرعدا هاتووە، ئەگەر چی تەكلیف لێكراویش نەبن .

وە بۆ منداڵان و شێتەكان هیچ نەهاتووە سەبارەت بە قەرەبوو كردنەوە، و سزا دانیان .

## بەشێك

**٢٧٠** - وە تەكلیف لێكراوان لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەكرێ لە ڕۆژی قیامەت، كە ئیمانداران لەوانن؛ جگە لەوانەی كە لەبارەیانەوە :

**٢٧١** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (ئەوان دەچنە بەهەشتەوە بە بێ لێپێچینەوە كردن لەگەڵیان) .

---

: مەبەستی ئەو فەرموودەیەیە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (ئەوانە كەسانێكن باڵندە بە شووم سەیر ناكەن، داوای ڕوقیە لە كەس ناكەن، وە كەوی بەكارناهێنن، وە پشتیان بە پەروەردگاریان بەستووە)، بەڵام والله اعلم، ابن تيمية وتویەتی ئەم ڕیوایەتە هەڵەی تێدایە چونكە پێغەمبەر ﷺ ڕوقیەی لەسەر خۆی خوێندووە و جیبریلیش لەسەری خوێندووە .

**٢٧٢** - بەڵام كافران لێپرسینەوەیان لەگەڵ ناكرێت، هەر وەكو الله عزَّوَجَل فەرموویەتی : ﴿ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ ﴿٧٧﴾ ﴾[آل عمران] .

وە ئەمما ئەوەی كە لە قورئان هاتووە دەربارەی لێپرسینەوە لەگەڵیان، ئەوا مەبەستی پاداشتی ئەوانە، هەروەكو فەرموویەتی :

﴿ عَطَآءً حِسَابًا ﴿٣٦﴾ ﴾ [النبأ] واتە : پاداشتێکی کافی .

وە فەرموویەتی : ﴿ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ ﴿١١٧﴾ ﴾ [المؤمنون] واتە : پاداشتەکەی .

وە فەرموویەتی : ﴿ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا ﴿٨﴾ ﴾ [الطلاق] .

واتە : پاداشتمان دایەوە .

وە کتێبێکم لەسەر سالمیەکان لەبارەی ئەم بابەتەوە جیا کردووەتەوە؛ لەبەرئەوەی لای ئەوان کافران لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت .

---

: ڕوون کردنەوە لەسەر ئەثەری ٢٧٢ :

مجموع الفتاوى (٣٠٥/٤) هاتووە کە پرسیار لە ابن تیمیة کراوە سەبارەت بە کافران ئاخۆ لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێ یان نا؟

لە وەڵامدا دەڵێت : ئەم بابەتە ناکۆکیەکی زۆری تێدا هەبووە لە نێوان هاوەڵە موتەئەخیرینەکانی احمد دا . . . پاشان درێژەی بە قسەکردن دا وتی : مەبەست لە لێپرسینەوە بریتییە لە :

١ - نیشاندانی کردەوەکانیان وە لۆمەکردنیان لەسەری .

٢ - وە مەبەست لە لێپرسینەوە کێشانی چاکەکانیانە بە خراپەکانیان .

جا ئەگەر مەبەست لە وتنی لێپرسینەوە مانای یەکەم بوو، ئەوا هیچ گومانی تێدا نییە کە بەم شێوازە لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێ .

بەڵام دووەم : ئەگەر مەبەست پێی ئەوە بوو کافران چاکەکانیان بۆ دەمێنێتەوە و وایان لێدەکات موستەحەقی بەهەشت بن؛ ئەوا ئەمە هەڵەیەکی ئاشکرایە، وە ئەگەر مەبەست پێی نەمانی سزا بوو

لەسەریان : ئەوا سزای کەسێك کە خراپەی زیاترە گەورەترە لە سزای کەسێك کە خراپەی کەمترە، وە هەر کەس چاکەی هەبوو سزای لەسەر ئاسانتر دەکرێت هەروەکو چۆن ابو طالب سزای کەمتر وەردەگرێ لە ابو لهب، جا الله دەفەرموێت : ﴿**الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ زِدْنَاهُمْ عَذَابًا فَوْقَ الْعَذَابِ**﴾ [النحل : ٨٨]، وە فەرموویەتی : ﴿**إِنَّمَا النَّسِيءُ زِيَادَةٌ فِي الْكُفْرِ**﴾ [التوبة : ٣٧]، وە ئاگر چین چینە، جا ئەگەر هەندێ لە کافران سزاکەی سەختر بوو لە هەندێکی تریان بە هۆی زۆری تاوانەکانی، و کەمی چاکەکانیەوە، ئەوا لێپرسینەوە بۆ دیاری کردنی پلەی سزایە بۆیان نەك بۆ ئەوەی بچنە بە هەشتەوە .

**٢٧٣** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ئەم ئوممەتە کە حەشر دەکرێت دابەش دەبێ بۆ سەر سێ کۆمەڵە : کۆمەڵەیەکیان دەچنە بەهەشتەوە بەبێ لێپرسینەوە، وە کۆمەڵەیەکیان لێپرسینەوەیەکی ئاسانیان لەگەڵ دەکرێت پاشان دەچنە بەهەشتەوە، وە کۆمەڵەیەکیان لەسەر پشتیان بە نمونەی چیا داکوتراوەکان تاوان دەهێنن، ئینجا الله لەبارەیانەوە پرسیار دەکات لەکاتێکدا لە هەمووان زاناترە پێیان، دەفەرمووێت : ئەوانە چین؟

دەوترێت : کۆمەڵە بەندەیەکن لە بەندەکانت .

جا دەفەرمووێت : لەسەریان لایبەرن، و بیکەنە سەر پشتی گاور و جولەکەکان، وە بیانخەنە بەهەشتەوە بە ڕەحمەتی من) .

---

: واتە ئەوان بکەنە بەهەشتەوە نەك گاور و جولەکە .

# بەشێك

٢٧٤ - وە هەموو تەكلیف لێكراوێك دوو فریشتەی لەگەڵدایە بە شەو و بە ڕۆژ چاودێری دەكەن ئەوەی خێر و شەڕ بێ لە ئینسانەكەوە چاودێری دەكەن و دەیپارێزن لای خۆیان، وە لە پەڕەكانیاندا دەینوسنەوە .

٢٧٥ - أحمد نەصی لەسەر ئەمە هەیە لە گێڕانەوەی المروذي دا .

٢٧٦ - وە پرسیاری لێكرا - واتە لە امام احمد - : ئایا كافرەكان فریشتەیان لەگەڵە لێیانەوە بنوسنەوە؟

جا ڕقی لێبوو قسەی تێدا بكا، و وتی : ﴿ مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ ١٨ ﴾ [ق].

٢٧٧ - پێچەوانەی موعتەزیلە كە وتیان : ئەوان ئەهلی ئەوە نین .

---

: واتە كافرەكان ئەهلی ئەوە نین فریشتەیان لەگەڵ بێت، والله اعلم .

٢٧٨ - بەڵگەمان :

فەرمایشتی الله تعالى : ﴿ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَٰفِظِينَ ۝١٠ كِرَامًا كَٰتِبِينَ ۝١١ ﴾ [الانفطار] .

وه لەم ڕووه ئايەت و فەرموودە زۆرە .



**٢٧٩** - وه دهستهكان، و پێیهكان، و پێستهكان :

قسه دهكهن، و شاهێدی لهسهر خاوهنهكهیان دهدهن له ئاخیرهتدا به كهلامێكی بیستراو لێیانهوه؛ دهكرێت دهستكهوتێك بێت بۆی .

وه دهكرێت پێویستیهكی تێدا بێت، بۆ ئهوهی ئاگاداری و تێگهیشتنی تێدا بێت .

بهڵگهمان لهسهری :

فهرمایشتی الله تعالى : ﴿ شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٠﴾ وَقَالُوا۟ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا ۖ قَالُوٓا۟ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ ﴿٢١﴾ ﴾ [فصلت] .

# باب : ٢٣

## دروستبوونی بەهەشت و ئاگر



بەهەشت و ئاگر دوو دروستکراون .

٢٨٠ - أحمد نەصی لەسەری هەیە؛ وە وتویەتی : هەر کەس وتی : بەهەشت و جەهەننەم دروست نەبوونە ئەوا کافرە .

٢٨١ - وە موعتەزیلە وتیان : دروست نەبوونە .

٢٨٢ - وە بەڵگە لەسەر ئەمە بریتییە لە : ئایەتە ڕاستەکان، وە ئەو هەواڵانەی کە ئەوە دەڵێن، وە چیرۆکی پێشووی ئادەم و ئیبلیس .

جا هەر کەس ڕەددی ئەمە بداتەوە؛ ئەوا قورئانی بە درۆ خستۆتەوە، وە ئەو کافرە .

٢٨٣ - وە حۆریە چاو گەشەکان دروست بوونە، وە ئەوان لە بەهەشتدان، فەوتانیان بەسەر نایەت، وە ناشمرن .

الله تعالى فەرموویەتی : ﴿ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ ﴿٥٦﴾ ﴾ [الرحمن] .

وه فەرموویەتی : ﴿ حُورٌ مَّقۡصُورَٰتٌ فِي ٱلۡخِيَامِ ۝٧٢ ﴾ [الرحمن] .

**٢٨٤** - وه پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (حۆریەکان دەڵێن : ئێمە حۆریە چاکەکانین، ڕاگیراوین بۆ هاوسەرانێکی بەڕێز) .

**٢٨٥** - وه (دەڵێن : ئێمە نەمرەکانین و هەرگیز نامرین، وه ئێمە نەرم و نیانەکانین و هەرگیز توند نابین، وه ئێمە نیشتەجێکانین و هەرگیز لاناچین، وه ئێمە ڕەزامەندەکانین و هەرگیز توڕە نابین) .

---

: ئەم دوو فەرموودەیە صحیح نین .




**٢٨٦** - وە بەڕاستی أحمد رحمه الله تەكفیری : موعتەزیلەی كردووە .

**٢٨٧** - وە قەدەریيەكانیش .

---

: أبو بكر دەڵێت : پرسیارم لە احمد كرد دەربارەی قەدەریەكان؟ ئەوجا تەكفیری نەدەكردن ئەگەر دانیان بە علم دا بنایە [السنة للخلال (٨٥٨)]، جا والله اعلم، وا دیارە امام احمد لەبەر نەفی كردنی صفاتی الله تەكفیری كردوون، هەر وەكو علم و مشیئة .

**٢٨٨** - وە جەهمییەكانیش لە زۆر گێڕانەوەدا - تەكفیری كردوون - .

**٢٨٩** - وە هەروەها كوفری لەفزییەكانیشی بڕاندووەتەوە .

---

: عبدالله بن أحمد لە (السنة - ١٧٠)، وتی : گوێم لە باوكم بوو دەیوت : هەركەسێ بڵێ : لەفزم بە قورئان مەخلوقە، ئەوا قسەیەكی خراپی كردووە، ڕەت دەكرێتەوە، وە ئەوە قسەی جەهمیەكانە .

پێم وت : الكرابیسی وا دەڵێت .

وتی : درۆی كرد، الله ئابڕووی ببات، كەسێكی پیسە .

وە وتی : الكرابیسی جێی بشر المریسی گرتووەتەوە .

**٢٩٠** - وە ئەو خەواریجانەشی تەکفیر کردووە کە عثمان و علي بە فاسق دەزانن.

**٢٩١** - وە حوکمی ڕافضە ش لەمەدا بە هەمان شێوەیە .

**٢٩٢** - بەڵام بۆ مورجیئە دەکەوێتەوە سەر تەفاصیل و وردەکاری .

---

: لە السنة للخلال (٩٧٢) هاتووە کە : اسماعیل بن سعید وتی : ئایا دەترسی لەوەی کە کوفر بکەوێتە سەر کەسێك کە دەڵێت : ئیمان وتەیە بەبێ کردەوە؟ وتی : بەمە تەکفیر ناکرێن .

جا ئەوانەی کە دەڵێن ئیمان وتەیە تەکفیر نەکراون بەڵکو تبدیع کراون، ئەمما ئەوانەی کە دەڵێن ئیمان تەنها ناسینە بە دڵ ئەوا تەکفیر کراون، هەروەکو لە السنة للخلال (٢٣٣) هاتووە کە :

احمد وتی : جەهمیەکان دەڵێن : ئەگەر پەروەردگاری بە دڵ ناسی، وە تەنانەت بە ئەندامەکانیشی کردەوە نەکات، ئەوە ئیمانداره؛ جا ئەم قسەیە کوفرە .

**٢٩٣** - وە لەبارەی موشەبیهەوە وتویەتی : هەر کەسێك وتی : اللّٰه دەستی هەیە وەکو دەستی من؛ ئەوا اللّٰه ی چواندووە بە دروستکراوەکانی؛ وە ئەمە کوفرە .

**٢٩٤** - اللّٰه تعالى فەرموویەتی : ﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ ﴾ [الشورى] وە ئێمە وەصفی اللّٰه ناکەین جگە بەوەی کە وەصفی خۆی پێکردووە، یان پێغەمبەرەکەی وەصفی پێ کردووە، یان ئەوەی کە ئوممەت کۆدەنگی هەیە لەسەری .

**٢٩٥** - وە ئەگەر وترا : ئەوە چۆن دەبێت؟

دەڵێین : تەفسیری ناکەن، وە نەمان بیستووە کەسێك تەفسیری کردبێت .

**٢٩٦** - وە بە أم سلمة رضي الله عنها وترا دەربارە فەرمایشتی الله تعالى :

﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ۝٥ ﴾ [طه] چۆن استوای کردووە؟

فەرمووی : چۆنیەتیەکەی نەزانراوە، وە استواء مەعقول نییە، وە دان پێدانانی ئیمانە، و نکۆڵی لێکردنی کوفرە، وە پرسیار کردن دەربارەی بیدعەیە .

---

: ئەم ڕیوایەتە کە وتویەتی استواء معقول نییە ڕیوایەتی ربیعة ی شێخی امام مالکە رحمهما الله، بەڵام لە ڕیوایەتەکانی دیکەدا ئەم لەفزە جیاوازە کە بەم شێوانە هاتووە : (نەزانراو نییە، هەر وەکو ئەوەی وەصفی خۆی پێکردووە، زانراوە، ..هتد)

وە لەوانەیە ئەم ڕیوایەتە مفوضة کان استدلالی پێ بکەن، جا هیچ حوججەیەکی بۆ ئەوان تێدا نییە، بەڵکو حوججەیە بەسەریانەوە، چونکە : واتاکەی ئەوەیە عەقڵ ناتوانێت قسەی تێدا بکات، جا بە پێی ڕیوایەتەکانی دیکە واتای استواء زانراوە، بەڵام لێرەدا والله اعلم مەبەستی چۆنیەتیەکەیەتی، ئەهلی علم وتویانە کە ئەو لەفزەی وتویەتی (چۆنیەتیەکەی معقول نیە، وە استواء نەزانراو نییە) ئەوەیان صحیحە نەك ئەمەی کە نوسەر نەقڵی کردووە .

**٢٩٧** - وە عبدالله بن احمد وتی : پرسیارم لە باوکم کرد سەبارەت بە کەسێك کە دەڵێت : کاتێك الله قسەی لەگەڵ موسادا کرد، قسەی نەکرد بە دەنگ .

باوکم وتی : الله سبحانە بە دەنگ قسەی کرد، وە ئەم فەرموودانە دەیگێڕینەوە هەر وەکو ئەوەی کە هاتوونە .

وه باوكم وتى : فەرموودەی ابن مسعود رضي الله عنه كه دەفەرموێت : ئەگەر الله قسه بكات دەنگێكی لێوه دەبیسترێت وەكو دەنگی زنجیر هێنان به بەردی لوسدا .

وه باوكم وتى : وه ئەم جەهمییانه ئینكاری لێ دەكەن .

وه باوكم وتى : ئەوان كافرن؛ دەیانەوێ چەواشەی خەڵكی بكەن .

هەر كەس پێی وابێت الله قسەی نەكردووه ئەوا كافره، ئێمه هیچ ناكەین جگه لەوەی كه ئێمه ئەم فەرموودانه دەگێڕینەوه هەر وەكو ئەوەی كه هاتوون .

**٢٩٨** - وه عبدالله بن احمد دەیوت : بیستم أبو معمر الهذلي دەیوت : هەر كەس وتی الله عزَّوَجَل قسه ناكات، و نابیستێت، و نابینێت، و توڕه نابێت، و ڕازی نابێت، وه چەند دانەیەكی دیكەی لە سیفات باس كرد، ئەوا ئەو كەسە كافره به الله تعالى، ئەگەر بینیتان لەسەر بیرێك وەستابوو ئەوا پاڵی پێوه بنێن بۆ ناو بیرەكه، الله فەرمانی بەمه كردووه، لەبەرئەوەی ئەوان كافرن به الله تعالى .




**٢٩٩** - سلمة بن شبيب بۆی باسكردين، وتی :

لای احمد بن حنبل بووین جا پیاوێك هاته لای وتی : احمد بن حنبل له كوێيه؟

جا برديان بۆ لای، وتی : دوێنێ الخضر هاته خەونم، پێی وتم : برۆ بۆ لای احمد بن حنبل پاشان پێی بڵێ : الله لێت ڕازييه، وه هەروەها هەڵگرانی عەرش، و دانيشتوانی ئاسمانەكانيشی - لێت ڕازين - .

**٣٠٠** - عزرة بن عبدالله و طالوت بن لقمان بۆيان باسكردين، وتيان : بيستمان زكريا بن يحيى دەيوت : له خەونمدا احمد بن حنبل م بينى و تاجێكی ڕازێنراو به گەوهەری لەسەردا بوو، وه دوو نەعلی له پێدا بوو به له خۆبايي بوونەوه پێيەوه دەڕۆيشت .

پاشان وتم : ئەی باوكی عبدالله، الله چی لێكردی؟

وتی : لێم خۆشبوو، وه له خۆی نزيكی كردمەوه، وه به دەستی خۆی ئەم تاجەی لەسەر كردم، وه پێی فەرمووم : ئەمه به هۆی ئەو قسەيەتەوه كه وتت : قورئان كەلامی الله يه و مەخلوق نييه .

وتی : وتم : ئەی ئەم لەخۆبايي بوونه چيه كه نەمزانيوه تۆ مەتبوبێت له ژيانی دونيادا؟

وتی : ئەمە ڕۆیشتنی خزمەتکارەکانە لە ماڵی السلام - واتە لە بەهەشت، والله اعلم - .

٣٠١ - وە قتيبة بن سعيد وتی : ئەگەر پیاوت بینی احمد بن حنبل ی خۆش دەوێت، ئەوا لەسەر سوننەتە، هەر کەس پێچەوانەی ئەمە بکات ئەوا بزانە بیدعەچییە .

٣٠٢ - عبدالوهاب الوراق وتی : ئەگەر پیاو قسەی کرد - واتە قسەی خراپ - دەربارەی هاوەڵانی احمد، ئەوا تۆمەتباری بکە بەوەی کە خراپەیەکی شاراوەی هەیە، ئەو خاوەن سوننەت نییە .

٣٠٣ - نصر بن خالد وتی : هەر کەس وتی : یەکێك لە هاوەڵانی احمد لاوازە؛ ئەوا مەبەستی احمد بووە .

---

: مەبەست لە لاوازی لێرە، لاوازی دینە نەك فەرمووده، والله اعلم، وە ئەهلی بیدەع بۆیە تانەیان لە هاوەڵانی احمد و حەنبەلیەکان داوە، چونکە لەو سەردەمەدا زۆربەی ئەوانەی ئەهلی سوننە بوون حەنبەلی بوون، جا مەبەستیان لە تانە دان لە حەنبەلیەکان بە گشتی مەبەستیان لە ئەهلی سوننە بووە، نەك خودی مەزهەبەکە، چونکە ئەم مەزهەبانە مەزهەبی اصولی نین و هەر یەک لە مالك و الشافعي و احمد هەمان بیروباوەڕیان هەبووە رحمهم الله .

٣٠٤ - مردويه الصائغ هاوەڵەکەی الفضيل وتی : ئەگەر پیاوێك بێت بۆ لام لە هاوەڵانی فەرمووده و نەیناسم، ئەوا جورئەتی باسکردنی احمد بن حنبل دەکەم؛ جا

ئەگەر بینیم پێشی دەخات، پەنای دەدەم، وە ئەگەر بینیم بێدەنگ دەبێت، تۆمەتباری دەکەم .

**٣٠٥** - ابو عبيد القاسم بن سلام دەیوت : دانیشتم لە لای یحیی بن سعید، وە عبدالرحمن بن مهدي، و ابو یوسف القاضي، و محمد بن الحسن، و هاوشێوەکانیان لە مەسائیلەکاندا، جا کەسم نەبینی بە هەیبەت تر بێت لە احمد بن حنبل رضوان الله علیه .

# باب ٢٤:

## دەربارەی باسکردنی هاوەڵان رضي الله عنهم أجمعين



٣٠٦ - ابن عمر رضي الله عنهما، فەرمووی : لە سەردەمی رسول الله دا ﷺ کەسمان لە دوای پێغەمبەرەوە ﷺ یەکسان نەدەکرد بە : ابو بکر، پاشان عمر، پاشان عثمان، دواتر وازمان دەهێنا و فەزڵمان نەدەدا بە کەس لە نێوانیاندا - واتە لە نێوان هاوەڵانی تردا فەزڵی کەسانێکمان نەدەدا بەسەر کەسانێکی تردا - .

ئەم فەرموودەیە البخاري دەری هێناوە، لە ابن بزيغ، لە شاذان، لە عبدالعزيز ـەوە .

بە سەنەدێکی عالی کەوتووەتە دەستمان، وەکو بڵێی شێخەکەمان بۆی باسکردبێتین لە البخاري ـەوە .

وە احمد گێڕاویەتیەوە، لە ابو سلمة الخزاعي منصور بن سلمة، لە عبدالعزيز ـەوە .

٣٠٧ - لە محمد بن الحنفية وە، وتی :

بە باوکم وت : باوکە، کێ باشترین کەسە لە دوای پێغەمبەر ﷺ ؟

فەرمووی : کوڕم، نایزانیت؟! وتم : نا .

فەرمووی : ابو بكر . وتم : پاشان كێ؟

فەرمووی : كوڕم، نایزانیت؟! وتم : نا .

وتی : عمر .

وتی : پاشان لێم پرسیەوە، وتم : باوكە، پاشان تۆ سێیەمیت؟

فەرمووی : كوڕم، باوكت پیاوێكە لە موسڵمانان، ئەوەی بۆ هەیە كە بۆ ئەوانیش هەیە، وە ئەوەی لەسەرە كە لەسەر ئەوانیشە .



## بەشێك

**٣٠٨** - وە پێشەوا لە دوای پێغەمبەرەوە ﷺ ابو بكر ە بە حەق .

وە بەڵگە لەسەری بریتییە لە : مەبەستی پشتیوانان، و خیلافی نێوانیان، وە بەیعەت پێدانی عمر بۆ ابو بكر، وە بەیعەت پێدانی پشتیوانان و كۆچكەران بۆ ئەو .

**٣٠٩** - علي رضي الله عنه فەرمووی : ڕازی بووین بۆ دونیامان بەو كەسەی كە پێغەمبەر ﷺ ڕازی بوو لێی بۆ دینەكەمان، بۆیە بەیعەتمان بە ابو بكر دا .

---

: مەبەست لەوەی : (كە ڕازی بووە لێی بۆ دینەكەمان) ئەوەیە : كاتێك رسول الله ﷺ نەخۆش بوو نەیدەتوانی پێش نوێژی بكا بۆ هاوەڵان، فەرمانی كرد ابو بكر رضي الله عنه پێش نوێژیان بۆ بكات وە پێی ناخۆش بوو كەسێكی تر جگە لەو پێش نوێژی بكات .

**٣١٠** - وە پێی وت كاتێك ابو بكر رضي الله عنه وتی : (لامبەرن - واتە لە خیلافەت - ).

وتیان : سوێند بە الله لات نابەین، وە داوای لاچوونیشت لێ ناكەین، رسول الله ﷺ پێشی خستیت، جا كێ پاشت دەخات؟

**٣١١** - وە بە علي رضي الله عنه وترا : نابیتە خەلیفە بەسەرمانەوە؟

فەرمووی : نابمە خەلیفە، بەڵام ئەگەر الله باشەی بۆ ئەم ئوممەتە بوێت ئەوا کۆدەنگیان دەکات لەسەر باشترینیان، هەر وەکو چۆن کۆدەنگی کردن لەسەر باشترینیان - لەسەر باشترینیان واتە لەسەر امام ابو بکر رضی الله عنه - .

٣١٢ - وە لەمەدا ڕەتکردنەوە هەیە بۆ قسەی ئەو کەسەی کە وتی :

علي و زبير رضي الله عنهما دواکەوتن لە بەیعەت پێدانی .




**٣١٣** - ابن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : بەردەوام بە عیزەت بووین، لەو کاتەوەی کە عمر بن الخطاب رضي الله عنه موسڵمان بوو .

ئەمە فەرموودەیەکی صحیحە، البخاري دەریهێناوە : لە محمد بن المثنى، لە يحيى ـەوە.

هەروەها لە ابن كثير، لە سفيان، لە اسماعيل ـەوە .

بە سەنەدێکی عالی کەوتووەتە دەستمان؛ وەکو بڵێیت شێخەکەمان لە البخاري ـەوە بۆی باس کردبێتین .

**٣١٤** - ابن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : موسڵمان بوونی عمر فەتحێك بوو، وە کۆچکردنی سەرکەوتنێك بوو، وە کاربەدەستبوونی ڕەحمەتێك بوو .

**٣١٥** - وە حذيفة رضي الله عنه فەرمووی : کاتێك کرا بە خەلیفە - واتە امام عمر - ئیسلام وەکو پیاوێك بوو کە ڕووی لێمان بوو هیچ شتێك زیادی نەدەکرد لێوەی نزیك بوونەوەی نەبێت، دواتر کە کوژرا وەکو پیاوێکی لێهات پشتی لێمان بێ هیچ شتێك زیادی نەدەکرد لێوەی دوور بوونەوەی نەبێت .

**٣١٦** - وە ئەو پێشەوایە لە دوای ابو بكر بە حەق، پێچەوانەی رافضة کە دەڵێن : هەرگیز پێشەوا نەبووە .

بەڵگەمان :

**٣١٧** - ئەوەی کە لە ابن عباس رضي الله عنهما گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی : بە ابو بكر یان وت : سبەینێ کە گەشتی بە پەروەردگارت چی پێ دەڵێیت کاتێك عمر ت كرد بە خەلیفە بەسەرمانەوە، لە کاتێکدا توندوتیژیەکەیت زانیوە؟ - واتە زانیوتە عمر توندە - .

فەرمووی : دەڵێم : باشترین ئەهلی تۆم كرد بە خەلیفە بەسەریانەوە .

**٣١٨** - وە لە ابن مسعود ـەوە رضي الله عنه فەرمووی : داناترین کەسانێك سێ کەسن :

هاوسەرەکەی موسا علیه السلام کە وتی :

﴿ قَالَتْ إِحْدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُ ۖ إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ ﴿٢٦﴾ ﴾

[القصص] .

وە ماوەڵەکەی یوسف علیه السلام کە وتی :

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ ﴿٢١﴾ ﴾ [يوسف] .

وە ابو بكر کاتێك عمر ی کرد بە خەلیفە .




**٣١٩** - وە پێشەوا لە دوای عمر : عثمان ە رضي الله عنه .

دووبارە پێچەوانەی رافضة .

بەڵگەمان :

**٣٢٠** - ئەوەی کە لە ابن عمرەوە رضي الله عنه گێڕراوەتەوە کاتێك عثمان گەمارۆ درابوو دەرچوو بۆ لای خەڵکی - واتە ابن عمر - ، جا فەرمووی : کاتێك رسول الله ﷺ وەفاتی کرد، موسڵمانان سەیری باشترینی خۆیان کرد و کردیانە خەلیفە، کە ابو بکر بوو .

جا کاتێك ابو بکر رضي الله عنه وەفاتی کرد، سەیری باشترینی موسڵمانانی کرد و کردی بە خەلیفە، کە عمر بوو .

دواتر عمر وەفاتی کرد، موسڵمانان سەیری باشترینی خۆیان کرد و کردیانە خەلیفە کە عثمان ە .

بۆیە گەر بیکوژن، ئەوا کەسێکی باشتر لەو بهێنن، وە سوێند بە الله پێم وانییە وا بکەن - واتە لەو باشتر بوونی نەماوە تاکو بیهێنن و بیکەنە خەلیفە - .

**٣٢١** - له ابن عباس ەو رضي الله عنهما وتی : کاتێك پێغەمبەر ﷺ کچی دووەمی لێ مارەکرد، چوو بۆ لای و پێی فەرموو : (پیاوەکەت پێ چۆنە کچی خۆم؟) واتە : عثمان .

وتی : بە چاکە باسی کرد .

جا رسول الله ﷺ فەرمووی : (ڕێزی لێ بگرە چونکە ئەو لە هەموو هاوەڵانم زیاتر ڕەوشتی بە من دەچێت) .

---

: پێغەمبەر ﷺ دوو کچی خۆی لە امام عثمان مارەکردووە، بەڵام دانەیەکیان مردووە ئینجا ئەوی تری لێ مارە کردووە چونکە دوو خوشك لە هەمان کاتدا مارە ناکرێن لە یەك پیاو .




٣٢٢ - وە پێشەوا لە دوای عثمان : علي بن ابي طالب ە رضي الله عنه .

٣٢٣ - پێچەوانەی خەواریجەكان لە ئەو وتەیەیان كە دەڵێن : هەرگیز پێشەوا نەبووە .

بەڵگەمان :

٣٢٤ - ئەوەی لە محمد بن الحنفية گێڕدراوەتەوە كە فەرموویەتی : لای علي بن ابي طالب بووم وە عثمان ئەو كات گەمارۆ درابوو، جا پیاوێك هات بۆ لای وتی : پێشەوای بڕواداران كوژراوە لەم كاتەدا - واتە عثمان - .

وتی : علي ڕۆشت بۆ ماڵەكەی - عثمان - ، و عثمان كوژرابوو، جا چووە لای دەرگاكە و هاتنە ژوورەوە بۆ لای .

پاشان وتیان : عثمان كوژراوە، وە خەڵكی هەر دەبێت خەلیفەیەكیان هەبێت، وە كەس نازانین بەوە شایستەتر بێت لە تۆ .

علي فەرمووی : منتان نەوێت، چونكە من وەزیر بم بۆتان باشترە لەوەی پێشەوا بم .

وتیان : نا واللە، كەس نازانین شایستەتر بێت بەوە لە تۆ .

دواتر علي فەرمووی : جا ئەگەر سەرپێچیم بکەن - واتە نەمکەن بە وەزیر و بمکەنە پێشەوا - ، ئەوا بەیعەت پێدان بە من نابێت نهێنی بێت، بەڵکو دەرۆمە دەرەوە بۆ مزگەوتەکە جا هەر کەس ویستی لێبوو بەیعەتم بداتێ دەمداتێ .

وتی : پاشان دەرچوو بۆ مزگەوت و خەڵکی بەیعەتیان پێی دا .

**٣٢٥** - لە قیس بن عباد ەوە، وتی : لە ڕۆژی الجمل دا - واتە جەنگەکەی نێوان علي و معاویە رضي الله عنهما - گوێم لە علي بوو رضي الله عنه دەیفەرموو : یا الله من بەری بوونی خۆم بۆ تۆ ڕادەگەیەنم لە کوشتنی عثمان، وە بەڕاستی مێشکم جەنجاڵ بوو ئەو ڕۆژەی کە عثمان کوژرا، وە ئینکاریم لە نەفسی خۆم کرد، جا هاتن بۆ لام بۆ بەیعەتم بدەنێ، وتم : سوێند بە الله من شەرم دەکەم بەیعەت بە کەسانێك بدەم کە کەسێکیان کوشتووە کە رسول الله ﷺ لە بارەیەوە فەرموویەتی : (ئایا شەرم نەکەم لە کەسێك کە مەلائیکە شەرمی لێ دەکات) .

وە من شەرم دەکەم لە الله کە بەیعەتم پێبدرێت و عثمان یش کوژراوە لەسەر زەویە و هێشتا نەنێژراوە .

فەرمووی : بڵاوەی لێ بکەن، جا کاتێك کە نێژرا، خەڵکی گەڕانەوە و داوای بەیعەتیان لێم کرد .

جا وتم : یا الله من لەوە دەترسم کە بەرەو ڕووی دەرۆم .

پاشان خەڵکەکە هاتن، ئەوجا بەیعەتم پێدرا .

وه كاتێك پێیان وتم : (ئەی پێشەوای بڕوادارن)، هەر وەكو ئەوە وابوو كە دڵم بوەستێت، جا دەستم بە گۆچانێكەوە گرت، وتم : یا اللّٰه وەریبگرەوە بۆ عثمان رضي اللّٰه عنه .

## بەشێك

ئەمما شەڕکردنی - واتە امام علي - لەگەڵ : طلحة، و زبیر، و عائیشة، و معاویة رضي الله عنهم .

**٣٢٦** - ئەو نوسراوانەی لە احمد ەوە هاتوون بریتین لەوەی کە زمانمان بگرین لە باسکردنیان .

پاشان فەرمایشتی الله تعالی ی خوێندەوە : ﴿ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٣٤﴾ ﴾ [البقرة] .

وە فەرمایشتی الله : ﴿ وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ [الحجر] .

**٣٢٧** - وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (نەکەن باسی ئەو ناکۆکی و شەڕە بکەن کە لە نێوان هاوەڵانم ڕووی داوە) .

**٣٢٨** - وە فەرموویەتی ﷺ : (ئەگەر باسی هاوەڵانم کرا زمانتان بگرن) .

**٣٢٩** - وه فه‌رمووی ﷺ : (به‌ڕاستی ئه‌مه سه‌رکرده‌یه - واته حسن ی کوڕی امام علي - ، وه الله تعالى نێوانی دوو کۆمه‌ڵه له موسڵمانانی پێ چاك ده‌کاته‌وه) .

جا نێوانی معاوية و ماوه‌ڵانی، له‌گه‌ڵ سه‌ربازه‌کانی خۆی پێ چاك کرده‌وه .

**٣٣٠** - وه موعته‌زیله ئه‌و که‌سه به فاسق ده‌زانن که شه‌ڕی له‌گه‌ڵ کردووه .

**٣٣١** - وه رافضة ته‌کفیری ده‌که‌ن .

---

: واته امام معاوية به کافر و فاسق ده‌زانن په‌نا به الله له‌به‌ر ئه‌وه‌ی شه‌ڕی له‌گه‌ڵ امام علي کردووه.

**٣٣٢** - وه خه‌واریجه‌کان ده‌ڵێن : کوفری کرد و له ئیسلام هه‌ڵگه‌ڕایه‌وه دوای ئه‌وه‌ی حوکمی دا له دینی الله دا، وه شه‌ڕی له‌گه‌ڵ ئه‌هلی قیبله‌دا کرد .

جا درۆیان کرد، به‌ڵکو پێشه‌وی ڕاسته‌قینه بوو هه‌تاوه‌کو کوژرا .

---

: ئه‌م قسه‌یه‌ی خه‌واریج اخزاهم الله ڕووی له امام علي ه، ئه‌وان به امام علي ان وت : تۆ حوکمی پیاوانت کرد، وه قورئانت نه‌کرده حاکم، جا به‌وه کوفرت کرد، چونکه حوکم بۆ که‌س نییه بۆ الله نه‌بێ !! (سنن النسائي - ٨٥٧٥) .

## بەشێك

**٣٣٣** - وە معاوية بن ابي سفيان رضي الله عنهما پێشەوایەتیەکەی دوای علي بن ابي طالب بوو، وە داوای خوێنی عثمان ی کرد رضي الله عنه، وە لەعنەتی لە بکوژەکەی کرد .

کاتێك ئەوەی کە بەسەر حسن دا هات، دەستبەرداری نەفسی خۆی بوو، وە بۆی گەڕاندەوە، وە ناو نرا بە : ساڵی جەماعەت .

**٣٣٤** - احمد وتی : بۆ ماوەی چل ساڵ مایەوە : بیست ساڵی پێشەوایەتی، وە بیست ساڵی خیلافەت، وە هیچ کەسێك بوونی نەبوو ئیللا سوپاسی دەکرد و لێی ڕازی بوو .

**٣٣٥** - وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((رحی)ی ئیسلام دەسوڕێتەوە - واتە بەردەوام دەبێت - بۆ ماوەی سی و پێنج ساڵ) .

وە مەبەست لە (رحی) لێرەدا : هێزە لە دیندا .

وە خیلافەتی معاوية لە کۆمەڵەی : پێنج ساڵەکە بوو، لەبەر ئەوەی سی ساڵەکە تەواو بوو بە خیلافەتی علي .

وه لەبەر ئەوەی مەرجەکانی پێشەوایەتی تێیدا بوونی هەیە، لەوانە : نەسەب؛ چونکە ئەو لە قورەیشە، وە زانست، و دین، و ئازایەتی، و باشیەتی ژیاننامەکەی ئەو لە ناو موسڵمانانداا، وە جگە لەمانە، جا ئەمانە وای لێ کرد پێشەوایەتیەکەی دروست بێت .

وە فەزیلەتەکانی لەوەدایە کە :

٣٣٦ - پێغەمبەر ﷺ لە بارەی معاوية وە فەرموویەتی : (یا الله بیکە بە ڕێنمونیکار، وە ڕێنمونیکراو، وە ڕێنمونی بکە، و ڕێنمونی پێ بکە) .

٣٣٧ - لە الحارث بن زیادی هاوەڵی پێغەمبەرەوە ﷺ ، کە رسول الله ﷺ دوعای بۆ معاوية کرد و وتی : (یا الله فێری نوسین - یان قورئان، والله اعلم - ، و حیسابی بکە، وە لە سزا بیپارێزە) .

٣٣٨ - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (الله ئەمین بوو دەربارەی وەحی لە سێ کەس : جبریل، و من، و معاوية) - چونکە امام معاوية رضي الله عنه وەحی دەنوسییەوە - .

٣٣٩ - لە جابر بن عبدالله وە رضي الله عنهما، کە پێغەمبەر ﷺ لە غەزای بەنی خلید دا تیرێکی دا بە معاوية، جا فەرمووی : (ئەی معاوية ئەمە بگرە، وە بەمە پێم بگەرەوە لە بەهەشتدا) .

**٣٤٠** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (من بیری کەس ناکەم لە بەهەشت جگە لە معاوية بن ابي سفيان، ئەگەر دوای ئەوە و ئەوە بینیمەوە، دەڵێم : لە کوێ بوویت؟

دەڵێت : لای پەروەردگارم بووم زیندووی دەکردمەوە، وە جوانی دەکردم بە دەستی خۆی، وە دەیفەرموو :

ئەمە لەبەر ئەوە کە لە دونیادا لە جەستەت درا) .

---

: ئەم فەرموودانە هیچیان صحیح نین جگە لە فەرموودەی ٣٣٧، والله اعلم، بەڵام لە زانایانی سەلەفەوە ئەثەر زۆر هەیە دەربارەی فەزیلەتەکانی ئەم هاوەڵە بەڕێزە.




**٣٤١** - لە عبداللە بن ظالم المازني ەوە، لە سعيد بن زيد بن عمرو بن نفيل ەوە، وتی : لەگەڵ رسول الله دا ﷺ لە ئەشكەوتی حراء دا بووین، جا فەرمووی : (هێمن بە ئەی حراء، چونكە ئێستا هیچ كەسێكت لەسەر نییە جگە لە پێغەمبەرێك، یان ڕاستگۆیەك، یان شەهیدێك) .

وتی : ئەوان كێن؟

وتی : رسول الله ﷺ ، و ابو بكر، و عمر، و عثمان، و علي، و طلحة، و الزبير، و سعد، و ابن عوف .

پێی وترا : ئەی دەیەم كێیە؟

وتی : وە من. وترا : خۆی .

سعيد بن زيد وتی : شاهێدی دەدەم لەسەر ئەو نۆیە كە لە بەهەشتدان، خۆ ئەگەر شاهێدیم لەسەر دەیەم بدایە گوناهم نەدەكرد .

**٣٤٢** - له عبدالرحمن بن عوف ەوە، وتی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (دە کەس لە بەهەشتدان) . ئایا شاهێدی بدەم؟

وتی : شاهێدی دەدەم، هەروەکو الله تعالى فەرموویەتی : ﴿ وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا ﴿٨١﴾ ﴾ [یوسف] .

---

: مەبەستی ئەوەیە ئاخۆ ئەو دە کەسەی کە لە فەرموودەکە مژدەی بەهەشتیان پێدراوە لە دونیا، ئایا بە ڕاشکاوانە شاهێدیان بۆ بدەین؟ بێگومان بەڵێ، هەروەکو لە (السنة للخلال - ٤٨٠) هاتووە کە امام احمد بە ڕاشکاوانە شاهێدی بەهەشتی بۆ ابو بکر و عمر داوە و بەڵگەشی بە فەرموودەکەی سعید بن زید هێناوەتەوە .



**٣٤٣** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (پیاوێك ناچێتە ئاگرەوە کە بەشداری بەدر، یان حودەیبیەی کردبێت) .

**٣٤٤** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (هیچ کەسێك لەوانەی لە ژێر دارەکە بەیعەتیان دا ناچنە ئاگرەوە) .

---

: مەبەستی داری رضوان ە کە امام عثمان درەنگ گەڕایەوە لە مەککە، جا ماوەڵان لە حودەیبیە لە ژێر دارەکە بەیعەتی مردنیان بە پێغەمبەر ﷺ دا .



## بەشێك

**٣٤٥** - لە ضمرة بن حبيب ـەوە، کە باسی عائشـة رضي الله عنها کرا لای رسـول الله ﷺ فەرمووی : (ئەو ڕۆژووانی نوێژ خوێنە، وە هاوسەری منە لە دونیادا) .

---

: لە اسنادی ئەم فەرموودەیەدا : ابن ابي مريم هەیە، کە بە ضعيف دانراوە لە لایەن : ابن معين، و النسائي و جگە لەوانیش.

**٣٤٦** - وە لە ابن عباس ـەوە رضي الله عنهما فەرمووی : ئەو شەوەی کە فاطمة گوێزرایەوە بۆ علي، رسـول الله ﷺ لە بەردەمیدا بوو، وە جبريل لە لای ڕاستی بوو، وە میکائیل لای چەپی بوو، وە حەفتا هەزار مەلائیکە لە پشتیەوە بوون، الله یان بە پاك و پیرۆز ڕادەگرت، هەتا کاتی الفجر .

## بەشێك

**٣٤٧ - لە ابن عباس ـەوە رضي الله عنهما کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :** (یا اللە لە عباس و منداڵەکانی خۆش بە، بە لێخۆشبوونێك لە هەموو گوناهە دیار و نادیارەکانی، یا اللە کوڕەکانی بکە بە جێنشینی خۆی) .

**٣٤٨ - وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :** (پیاوێك کە ئیمانی بە اللە و ڕۆژی دوایی هەبێت، ڕقی لە پشتیوانان نابێتەوە) .

**٣٤٩ - وە** (هەر کەس ڕقی لێیان بێت ئەوا اللە ڕقی لەوە) .

---

: پشتیوانان واتە ئەو ماوەڵانەی کە خەڵکی مەدینە بوون و پشتیوانیان لە پێغەمبەر ﷺ کرد .

**٣٥٠ - وە فەرمووی ﷺ :** (پێشەواکان لە قوڕەیشن) - واتە خیلافەت بۆ ئەوانە - .

**٣٥١ - وە فەرمووی ﷺ :** (جبریل پێی وتم : نەوەی هیچ باوکێکم نەدۆزیەوە باشتر بێت لە نەوەی هاشم) .



## بەشێك

**٣٥٢** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (الله الله لە هاوەڵانی من، مەیانکەن بە نیشانە لەدوای من - واتە قسەیان پێ مەڵێن، والله اعلم - جا هەر کەس ئەوانی خۆش بوێت ئەوا بە خۆشویستنم خۆشیانم دەوێت، وە هەر کەس ڕقی لێیان بێت، ئەوا بە ڕقی من ڕقم لێیانە، وە هەر کەس ئازاریان بدات، ئەوا ئازاری منی داوە، وە هەر کەس ئازاری من بدات، ئەوا ئازاری الله ی داوە، وە هەر کەس ئازاری الله بدات، گومان وایە بیگرێت - واتە لە ناوی ببا، والله اعلم - ) .

**٣٥٣** - فەرمووی ﷺ : (الله سبەینێ - واتە لە قیامەت - خەڵکی کۆدەکاتەوە لەسەر یەك زەوی وشکی خلیسك، جا لەناویاندا جنێودەران بە هاوەڵانم، و ئەوانەش کە ڕقیان لێیان بووە دەگیرێن، پاشان دەیانخاتە ئاگرەوە) .

**٣٥٤** - وە فەرمووی ﷺ : (نمونەی هاوەڵانم وەکو ئەستێرەکان وان) .

**٣٥٥** - وە ابو سعيد الخدري رضي الله عنه فەرمووی : نمونەی هاوەڵانی رسول الله ﷺ وەکو چاو وایە، جا دەرمانی چاو ئەوەیە واز لە دەست لێدانی بێنیت .

---

: مەبەستی ئەوەیە قسەیان پێ نەوترێ، والله اعلم .

**الحمدلله وەرگێڕانی ئەم کتێبە تەواو بوو، الله تعالی بیکاتە توێشوویەك بۆ قیامەتمان و لێمانی وەرگرتبێت، هەروەها بیکاتە مایەی سوود بۆ موسڵمانان، و صلى الله على نبينا محمد و على آله و صحبه و سلم .**